# بەشی دووەم

## لایەنی مەیدانیی

## تەوەرەی یەکەم

### ڕێوشوێنە میتۆدەکانی لایەنی مەیدانیی توێژینەوە

میتۆدی توێژینەوە

کۆمەڵگای توێژینەوە

ئامرازی توێژینەوە

## بەشی دووەم/ لایەنی مەیدانیی

## تەوەرەی یەکەم / ڕێوشوێنە میتۆدەکانی لایەنی مەیدانیی توێژینەوە

### -میتۆدی توێژینەوە :

### لەم توێژنەوەیەدا سوود لەچەند میتۆدێکی زانستی وەرگیراوە لەوانە:

یەکەم/ ڕوپێوی کۆمەڵایەتی: ڕێگەیەکە لەڕێگاکانی توێژینەوەی کۆمەڵایەتی بریتییە لەهەوڵێکی هاوبەش بۆ لێکۆڵینەوەی زانستیو چارەسەرکردنی ئەو کێشە کۆمەڵایەتییەی هەیە لەچوارچێوەی ناوچەیەکی جوگرافی دیاریکراوداو دائەنرێت بەپشکنینێکی فراوان بۆ بوارێك لەبوارەکان، لەم توێژینەوەیەدا سوود لەم میتۆدە وەرگیراوە بەمەبەستی رووپێوکردنی ئەو دیاردەیە.

دووەم/لێکۆڵینەوەی باری (دراسە حالیە) Case Study:

ئەم ڕێگایەش دادەنرێت بەڕێگایەکی گشتی لەتوێژینەوەی کۆمەڵایەتی بەئامانجی وەرگرتنی بەشێکی گەورە لەزانیاریی جۆراوجۆر بەتایبەتی لەسەر بارودۆخی کەسێك یان گروپێك یان دەزگایەك یان سیستمێکی کۆمەڵایەتی کە تیایاندا هۆکاری جۆراوجۆر بۆ کۆکردنەوەی زانیاریی بەکاردەهێنرێت وەکو بەڵگەنامەو دەفتەرەکانی تۆمارو یاداشتنامەکان.

لەم توێژینەوەیەدا چەند ژنوکچێك وەرگیراونو لێکۆڵینەوەی حاڵەتیان بۆ کراوە بەمەبەستی دەستکەوتنی چەند زانیارییەکی وردتر لەمەڕ دیاردەی توندوتیژییو ئەو کاریگەرییانەی لەسەر ڕەگەزی مێ بەجێیهێشتووە وەك نموونەیەك لەسەر ئەو توندوتیژییەی کە لەکۆمەڵگادا بەکاردێت بەرامبەر بەڕگەزی مێ.

نموونەش بۆ ئەمە مامان (م. ا) وتی: کچەکان لەتەمەنی منالێدا خەتەنەیان دەکەین لەبەرئەوەی کە بەئاسانی دەتوانین قاچو دەستی بگرینو خەتەنەی بکەینو برینەکەشی زوو چاکدەبێتەوە.

یەکێکی تر لەو کەسانەی کە خەتەنەکرابوو خاتوو (ك.ع) کە کەسێکی ئاستی ڕۆشنبیریی بەرزی هەبوو سێجار شوویکردووە لەلای هیچ پیاوێکیان نەماتەوەو تەڵاقدراوە کە لەلایەن بەشی تەندروستییەوە پرسی پزیشکێکی ژنان کرا هۆکەی چییە وتی: ئەمە زۆر بەخراپیی خەتەنەکراوەو تووشی ساردیی سێکس بووەو حەز بەچوونە لای پیاو ناکات.

مامان(گ.م) وتی: کە تەمەنم سیانزدە ساڵان بوو لەسەر کانی بوو ژنێك کچەکانی لادێکەی خەتنەدەکرد، بەبێ ئەوەی دایکم ئاگای لێبێت چووم بۆلای ژنەکەو خەتەنەی کردم، چونکە شەرمم لەدایکم دەکرد بڵێم با منیش خەتەنەبکرێم؟

مامانێکی تر (م. ا) کە باوکی خەلیفەبووە بەردەوام پێیدەوت ئاوی دەستی تۆ ناخۆم، چونکە سوننەت نەکراوی.

**کۆمەڵگای توێژینەوە:**

بەپێی دابەشکردنی شوێنی جوگرافیی شاروشارۆچکەو لادێو لە پارێزگای (سلیمانیو هەولێرو کەرکوكوخانەقین )چەند خوێندنگەیەکی ناوشاری سلێمانی.

**ئامرازی توێژینەوە:**

دابەشکردنی سێجۆر فۆرمی ئیستبیانی، یەکێکیان بۆ ژنانو کچانی ناو کۆمەڵ، ئەوی تریان بۆ ئەوکەسانەی کە کاری خەتەنەکردنیان ئەنجامداوە بەکارهاتووە کە بریتین لەکۆمەڵێك پرسیار بەشێوەیەکی سادەو کورت لەپاشکۆی توێژینەوەکەدا.

# بەشی دووەم

## تەوەرەی دووەم

## خستـــــتنەڕووی خـشـــــتەکـــــان و شـــــیکردنـــــەوەیـــــان

تەوەرەی دووەم/ خستنەڕووی خشتەکانو شیکردنەوەیان

لێرەدا بەپێی توانا هەوڵدراوە هەموو ئەو زانیارییانەی وەرگیراوە بەشێوەی خشتەنووسین بیانخەینەڕوو لەهەمانکاتدا شیکردنەوەیەکی سادە بۆ ئەو نەخشانە خراوەتەڕوو.

فۆرمی(أ) ئاماری ئاستی رۆشنبیریی لەسەر خەتەنەکردن نموونەی ئەو ژنوکچانەی بەشێوەیەکی هەرەمەکیی(عشوائی) وەرگیراوە.

**خشتەی ژمارە (أ-١) تەمەنی نموونەکە دەردەخات**

| تەمەن | کۆ | ڕێژە |
|---|---|---|
| ١٩٩٥-وبەرەوسەر | ١٠٠ | ٪٦,٧ |
| ١٩٨٥-١٩٩٤ | ٢٢٨ | ٪١٥,٣ |
| ١٩٧٥-١٩٨٤ | ٤٨٨ | ٪٣٢,٨ |
| ١٩٦٥-١٩٧٤ | ٣٨٦ | ٪٢٥,٩ |
| ١٩٥٥-١٩٦٤ | ١٥٥ | ٪١٠,٤ |
| ١٩٥٤وبەرەوخوار | ١٢٨ | ٪٨,٦ |
| کۆی گشتی | ١٤٨٥ | ١٠٠٪ |




سەرەتا تەمەنی ئەو کەسانە دەردەخات کە ئیستبیانەیان پڕکردۆتەوە دەردەخات، لەم توێژینەوەیەدا تەنها ڕەگەزی مێ وەرگیراوەو زانیارییەکان لەسەر (١٤٨٥) ژن کۆکراوەتەوەو دابەشکراوە بەسەر شەش یەکەی تەمەندا، کە تەمەنی (١٩٩٥و بەرەوسەر) ڕێژەی (٪٦,٧)ی نموونەکەیەو تەمەنی (١٩٨٥-١٩٩٤) ڕێژەی( ١٥,٣٪)، تەمەنی (١٩٨٤-١٩٧٥) ڕێژەی(٣٢,٨٪) زۆرترین ڕێژەی نموونەکەیەکەو تەمەنی (١٩٧٤-١٩٦٥) ڕێژەی(٢٥,٩٪)پێکدێنێت، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە زۆربەی ئەو ژنانە دەگرێتەوە کە تەمەنیان لەنێوان (١٢ — ٤٠) ساڵیدایەو تەمەنی ئەوانەی لەنێوان (١٩٦٤-١٩٥٥) ڕێژەیان لە( ٪١٠,٤)و ئەوانەی تەمەنیان( ١٩٥٤ بەرەو خوارە)( ٪٨,٦ )پێکدێنن.

**خشتەی ژمارە ( أ-٢ ) شوێنی نیشتەجێبوونی نموونەکە دەردەخات**

| شوێنی نیشتەجێبوون | کۆ | ڕێژە |
|---|---|---|
| شار | ٥٥٠ | ٪٣٧,١ |
| شارۆچکە | ٥٤٦ | ٪٣٦,٧ |
| لادێ | ٣٨٩ | ٪٢٦,٢ |
| کۆی گشتی | ١٤٨٥ | ٪١٠٠ |




**ئەم خشتەیە شوێنی نیشتەجێبوونی نموونەیی توێژینەوەکە دەردەخات** کە زۆرترین ڕێژە لەشار دانیشتون (٣٧,١٪ )و شارۆچکە بەڕێژەی (٣٦,٧٪) ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ زۆریی ژمارەی دانیشتوانو گەورەیی قەبارەی شار بەدوایدا شارۆچکە، بەپێی جیاوازیی ژمارەی دانیشتوان لەشارو شارۆچکەو لادێدا.

**خشتەی ژمارە (أ -٣) ئاستی خوێندنی نموونەکە دەردەخات**

| ئاستی خوێندن | کۆ | ڕێژە |
|---|---|---|
| نەخوێندەوار | ٣٠٨ | ٢٠,٧٪ |
| خوێندن و نوسین | ٢١٧ | ١٤,٦٪ |
| سەرەتایی | ٣١٧ | ٢١,٣٪ |
| ناوەندی | ٢٩٣ | ١٩,٧٪ |
| دواناوەندی | ٢٠٧ | ١٣,٩٪ |
| کۆلیج | ١٤٣ | ٩,٦٪ |
| کۆی گشتی | ١٤٨٥ | ١٠٠٪ |




**ئەمەش ئاستی خوێندنی توێژینەوەکە دەردەخات** لەنێو خێزانەکانو فەرمانگەکاندا کە بەرزترین ڕێژەی ئاستی خوێندنی سەرەتایی کە (٢١,٣٪)و نەخوێندەوار (٢٠,٧٪) کە ئاماژەیە بۆ ئەوەی ڕێژەی نەخوێندەواریی زۆرە، بۆیە ئاستی ڕۆشنبیریی نموونەی توێژینەوەکە لەئاستی نزمدایە، لەمەشەوە دەتوانین بڵێین کە ژنان لەکۆمەڵگای کوردیدا ئاستی خوێندەوارییان نزمەو توانای ڕووبەڕووبوونەوەی کێشەکانیان نییەو لەهەمانکاتدا شارەزای مافەکانی خۆشیان نین.

**خشتەی ژمارە (أ -٤) کارکردنی نموونەکە دەردەخات**

| کاردەکەیت | کۆ | ڕێژە |
|---|---|---|
| بەڵێ | ٦٠٢ | ٤١٪ |
| نەخێر | ٩٨٣ | ٥٩٪ |
| کۆی گشتی | ١٤٨٥ | ١٠٠٪ |




لەم خشتەیەدا ڕێژەی کارکردنی نموونەکە دەردەخات کە ڕێژەی (٤١٪)ی ژنان کار ناکەن‌و ڕێژەی (٥٩٪)ی ژنان کاردەکەن لەشێوەی جیاجیادا، کەواتە لێرەدا دەردەکەوێت لەگەڵ ئەوەی ڕێژەی ئەوانەی کاردەکەن زۆرترە، بەڵام لەچاو ئەو ئازادییەی ئێستاو بواری کارکردنی ژنان لەشوێنە جیاجیاکاندا کەمە، ڕەنگە ئەمەش بگەڕێتەوە بۆئەوەی کە دەرفەتی دامەزراندنیان بۆ نەرەخسابێت لەدامودەزگاکانی حکومەتدا یاخود وەك لەخشتەی پێشەوەدا دەرکەوتووە ڕێژەی نەخوێندەواریی نموونەکە زۆرترین ڕێژەی پێکهێناوە کە (٢٠,٧٪)یە بۆیە شوێنی کارکردنیان تەنها کاری نێوماڵەکانە.

**خشتەی ژمارە (أ-٥)**

I. **تەمەن و پرسیاری ئایا خەتەنەکراوە.**

| تەمەن | خەتەنەکراویت | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| | بەڵێ | ڕێژە | نەخێر | ڕێژە | کۆ |
| ١٩٩٥-وبەرەوسەر | ٦ | ٪٢ | ٩٤ | ٪١١ | ١٠٠ |
| ١٩٨٥-١٩٩٤ | ٤٥ | ٪٨ | ١٨٣ | ٪٢٠ | ٢٢٨ |
| ١٩٧٥-١٩٨٤ | ١٧٥ | ٪٣٠ | ٣١٣ | ٪٣٥ | ٤٨٨ |
| ١٩٦٥-١٩٧٤ | ١٧٢ | ٪٢٩ | ٢١٤ | ٪٢٤ | ٣٨٦ |
| ١٩٥٥-١٩٦٤ | ٩٧ | ٪١٥ | ٥٨ | ٪٦ | ١٥٥ |
| ١٩٥٤وبەرەوخوار | ٩٥ | ٪١٦ | ٣٣ | ٪٤ | ١٢٨ |
| | ٥٩٠ | ٪١٠٠ | ٨٩٥ | ٪١٠٠ | ١٤٨٥ |




ئەم خشتەیە ئەوە ڕۆشن ئەکاتەوە کە ئەو کچانەی تەمەنیان (لەسەروو ١٩٩٥)ەوەیەو منالّن ژمارەیان (١٠٠)کچە، ڕێژەی ئەوانەی کە خەتەنەکراون (٪٢)و ئەوانەی ئەم کردارەیان بۆ نەکراوە (٪١١)ەیە، بەمەش

دەردەكەوێت كە دیاردەی خەتەنە لەم گروپەدا كەمە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئاماژەیەكە بەوەی كە دیاردەكە بوونی هەیەو لەئێستادا خەڵكێك هەیە كە پەیڕەوی ئەو داب‌ونەریتانە ئەكات، سەبارەت بەو گروپەی كە تەمەنیان لەنێوان (١٩٦٤ بۆ ١٩٥٥) ژمارەیان (١٥٥) ژنەو (٩) ژن خەتەنەكراون كە ڕێژەیان(١٥٪)و (٥٨) ژن خەتەنەنەكراوە كە ڕێژەیان(٦٪)، ئەمەش ژیانی نەوەكانی پێشەوە دەردەخات كە تاكو چەندە پابەندی داب‌ونەریتە كۆنەكان بوون‌و خشتەكە ئەوە دەردەخات كە تاكو تەمەنی ژنان گەورەتربێت ئەوا دیاردەی خەتەنە لەنێو ژناندا گەورەترو زۆرترە.

**خشتەی ژمارە (أ-٥)**

II. **خەتەنەكراویت بە پێی ئاستی خوێندن**

| ئاستی خوێندن | خەتەنەكراویت | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| | كۆ | بەڵێ | ڕێژە | نەخێر | ڕێژە |
| نەخوێندەوار | ٣٠٨ | ٢٠١ | ٢٧,٨٪ | ١٠٧ | ١٤٪ |
| خوێندن و نوسین | ٢١٧ | ١٣٨ | ١٩,١٤٪ | ٧٩ | ١٠,٣٪ |
| سەرەتایی | ٣١٧ | ١٨٥ | ٢٥,٦٥٪ | ١٣٢ | ١٧,٢٪ |
| ناوەندی | ٢٩٣ | ١٢٢ | ١٦,٩٢٪ | ١٧١ | ٢٢,٣٨٪ |
| دواناوەندی | ٢٠٧ | ٥٤ | ٧,٤٨٪ | ١٥٣ | ٢٠٪ |
| كۆلیج | ١٤٣ | ٢١ | ٢,٩٪ | ١٢٢ | ١٥,٩٪ |
| كۆی گشتی | ١٤٨٥ | ٧٢١ | ١٠٠٪ | ٧٦٤ | ١٠٠٪ |




سەبارەت بەو پرسیارەی کە ئاستی خوێندەواریی‌و خەتەنەی ژنان ئەوا لەخشتەی ژمارە (أ-٥ اا )دا ڕێژەکان بەمشێوەیە دەبێت:

خشتەکە ئەوە ڕووندەکاتەوە کە بەپێی ئاستی خوێندەواریی ڕێژەی خەتەنەکردن لای ژنان گۆڕانی بەسەردا دێت، لەکۆی (٣٠٨) ژن ئاستی خوێندەوارییان لەئاستی نەخوێندەواریدا (٢٠١ژنیان) کە ڕێژەی(٢٧,٨٪)خەتەنەکراوەو (١٠٧ژن) کە ڕێژەی ( ١٤٪ )لەوانەش ئەم کارەیان بۆ ئەنجام نەدراوە بەرامبەر بەمە کە بەرزترین ئاستی خوێندەواریی کە ئاستی کۆلێژە لەکۆی(١٤٣)ژن تەنها (٢١ ژن) کە ڕێژەی(٢,٩٪)خەتەنەکراون‌و (١٢٢ ژن) کە ڕێژەی(١٥,٩٪) خەتەنەکراون، سەبارەت بەو ژنانەش کە خوێندەوارییان لەئاستی دواناوەندیدایە لەکۆی(٢٠٧ژن) کە ڕێژەی لە(٧,٤٨٪) خەتەنەکراوەو ڕێژەی (٢٠٪ )خەتەنە نەکراوە، هەموو ئەمانەش ئەوە دەردەخات کە خوێندەواریی‌و ئاستی ڕۆشنبیریی چەندە کاریگەریی هەیە لەسەر تاکەکانی کۆمەڵ‌و کۆمەڵگا، تاکو ئاستی خوێندەواریی نزمبێت ئەوەندە قەبارەی دیاردەکە گەورەتردەبێت لەلای ژن‌و بەپێچەوانەشەوە.

بۆیە گرنگە سەرجەم ڕێکخراوە حکومیی‌و ناحکومییەکانی ژنان گرنگی زۆر بەبەرزکردنەوەی ئاستی ڕۆشنبیریی بدەن، بەمەش داب‌ونەریتە کۆنەکان کە زەرەر بەبوون‌و تەندروستییان ئەدات کەمدەبێتەوە، لیرەشەوە دەکرێت هەوڵی جدیی بدرێت بۆئەوەی لەپرۆگرامی خوێندندا بابەتەکانی تەندروستی ژن‌و کاریگەریی داب‌ونەرێتەکانی لەسەر ژیانیان بخوێنرێت.

**خشتەی ژمارە (١-٥ )**

## ١- پرسیاری ئایا خەتەنەکراویت؟ بە پێی شوێنی نیشتەجێبوون

| شوێنی نیشتەجێبوون | کۆ | خەتەنە کراویت | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| | | بەڵێ | ڕێژە | نەخێر | ڕێژە |
| شار | ٥٥٠ | ٢٠٩ | ٪٢٨ | ٣٤١ | ٪٤٦ |
| شارۆچکە | ٥٤٦ | ٢١٤ | ٪٢٩ | ٣٣٢ | ٪٤٥ |
| لادێ | ٣٨٩ | ٣١٩ | ٪٤٣ | ٧٠ | ٪٩ |
| کۆی گشتی | ١٤٨٥ | ٧٤٢ | ٪١٠٠ | ٧٤٣ | ٪١٠٠ |




شوێنی نیشتەجێبوونو پرسیاری ئایا خەتەنەکراویت بەمشێوەیە کە لەخشتەی ژمارە (أ-٥)دا خراوەتەڕوو ژمارەی ئەو ژنانەی کە لەشاردا دەژین (٥٥٠ )ژنەو (٢٠٩) ژن بەبەڵێ وەڵامیان داوەتەوە کـە ڕێـژەی( ٢٨٪ )خەتەنەکراونو (٣٤١)ژن بەنەخێر وەڵامیان داوەتەوە کە ڕێژەی(٤٦٪)خەتەنە نەکراونو ڕێژەی ئەو ژنانەی کە لەشارۆچەکەکاندا دەژیـن (٥٤٦) ژنـەو(٢١٤)ژن کـە ڕێـژەی لـە(٢٩٪) بەبـەڵێ وەڵامیانداوەتـەوەو ڕێـژەی لە(٤٥٪)بەنەخێر، سەبارەت بەو ژنانەی لەلادێدا دەژین ژمارەیان(٣٨٩) ژنەو(٣١٨) ژن کە ڕێژەی لـە( ٤٣٪ )ئەو ژنانەی خەتەنەکراونو (٧٠)ژن کە ڕێژەی لە(٩٪ )نەکراون.

لێکۆڵینەوەکان ئەوەیان بەدیارخستووە کە شوێنی نیشتەجێبوون کاریگەریی زۆری لەسەر ژیـانی مـرۆڤ هەیـەو ئەم کاریگەرییەش لەکوردستاندا زیاتر بەدیـدەکرێت، چـونکە جیـاوازیی زۆر هەیـە لـەنێوان شاروشارۆچـکەو گوندەکاندا لەڕووی شێوازی ژیانو دابینکردنی خزمەتگوزارییـەکانو کرانـەوەیان بـەڕووی جیهانـدا، ئەمـەش کاریگـەریی سروشـتیو سیاسـیو ئـابووریی پێـوە دیـارە شـارەکان کـە مـۆدێلێکی پێـشکەوتووی شـوێنی پێکەوەژیانی مرۆڤە توانراوە لەشاردا ژیان باشترو چـاکتر ڕێکبخرێـتو کرانـەوەی شـارەکان بـەڕووی یـەکتردا بۆتەهۆی ئەوەی ژیانێکی پێشکەوتووتر بنیات بنرێتو گۆڕانی زۆر بەسەر داب‌ونەریتەکاندابێت، ژنان لەشـاردا توانیویانە پێشکەوتنی چاکترو باشتر بەدەستبێننو ڕۆشنبیرترن لەژنانی شارۆچکەو لادێکان، بۆیە لەخشتەکەدا ڕێژەکە گۆڕانی بەسەردادێت، دیاردەی خەتەنە لەشاردا کەمترە بەدوایـدا لەشارۆچـکەکاندا لەچـاو لادێکانـدا،

ئەمەش بەڕوونی هەستی پێدەکرێت، لەشاردا مرۆڤ پەیوەندییەکانی کەمتر ئـەبێتو بـەپێی بەرژەوەندییـەکانی بنیاتیدەنێت، بەمەش کاریگەریی کەسانی ترو دابونەریتەکان لەسەری کەمدەبێتەوە.

**خشتەی ژمارە (أ-٦)پرسیاری بەرای تۆ تاچەند ئە نجامدەدرێت؟**

**١-بە پێی تەمەن**

| تەمەن | تاچەندئەنجام دەدرێت ئێستا | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | زۆر | ڕێژە | زۆرکەم | ڕێژە | مام ناوەندی | ڕێژە | هیچ | ڕێژە | کەم | ڕێژە |
| ١٩٩٥- وبەرەوسەر | ٣ | ٢,٠٩٪ | ٦ | ٢,١٣٪ | ١٠ | ٣,٥٪ | ٢٥ | ٦,٥٪ | ٣٠ | ٨,٣٪ |
| ١٩٩٤- ١٩٨٥ | ٢٥ | ١٧,٤٪ | ٥٦ | ١٩,٩٪ | ٤١ | ١٤,٣٪ | ٥٧ | ١٤,٩٪ | ٤٩ | ١٣,٥٪ |
| ١٩٨٤- ١٩٧٥ | ٤٩ | ٣٤,٢٪ | ٩٦ | ٣٤,١٪ | ١٠٤ | ٣٦,٥٪ | ١٢١ | ٣١,٧٪ | ١١٨ | ٣٢,٦٪ |
| ١٩٧٤- ١٩٦٥ | ٣٠ | ٢٠,٩٪ | ٧١ | ٢٥,٣٪ | ٨٩ | ٣١,٢٪ | ٩٨ | ٢٥,٧٪ | ٩٠ | ٢٤,٩٪ |
| ١٩٦٤- ١٩٥٥ | ٢٣ | ١٦,٠٨٪ | ٣١ | ١١,٠٣ ٪ | ١٨ | ٦,٣٪ | ٤١ | ١٠,٧٪ | ٤٢ | ١١,٦٪ |
| ١٩٥٤و بەرەوەخوار | ١٣ | ٩,٠٩٪ | ٢١ | ٧,٤٧٪ | ٢٣ | ٨,٠٧٪ | ٣٩ | ١٠,٢٪ | ٣٢ | ٨,٨٦٪ |
| کۆی گشتی | ١٤ ٣ | ١٠٠٪ | ٢٨١ | ١٠٠٪ | ٢٨٥ | ١٠٠٪ | ٣٨١ | ١٠٠٪ | ٣٦١ | ١٠٠٪ |




**سەبارەت بەپرسیاری ئەوەی کە ئایا ئەم دیاردەیە بەبۆچوونی ژنان لەتەمەنە جیاجیاکاندا تا چەندە ئەنجامدەدرێت. لەخشتەی ژمارە (٦)دا دەردەکەوێت:**

ئەوانەی تەمەنیان (لەسەرو ١٩٩٥)وەیە لەکۆی(١٠٠) کچ(٣)کەسیان کە ڕێژەی( ٢,٠٩٪) پێیانوایە زۆر ئەنجامدەدرێتو (٦) کەسی تر کە ڕێژەی(٢,١٣٪) پێیانوایە کە زۆر کەم ئەنجامدەدرێتو (١٠) کچ لەوان کە ڕێژەی (٣,٥٪) پێیانوایە دیاردەکە لەنێوان ژنان مامناوەندەو ڕێژەی(٢٥) کەسیان کە ڕێژەی(٦,٥٪)پێیانوایە هیچ ئەنجامنادرێتو (٣٠) کەسیان کە ڕێژەی(٨,٣٪) پێیانوایە کەم ئەنجامدەدرێت، ئەو گروپەی کە تەمەنیان لە(١٩٥٤ وەبەرەو خوار) لەکۆی( ١٢٨ )ژن (١٣ )ژن کە ڕێژەی(٩,٠٩٪) پێیانوایە ئەم دیاردەیە لەنێوان ژناندا زۆر ئەنجامدەدرێتو (٢١) ژن(٨,٠٧٪ )هەست دەکەن دیاردەکە زۆر کەمەو (٢٣) ژن ڕێژەی(٨,٠٧٪)بۆچوونیان مامناوەندەو (٣٩) ژن لەوانە ڕێژەی (١٠,٢٪)ڕایان وایە کە هیچ ئەنجامنادرێتو (٣٢) ژن(٨,٨٦٪) لەم خشتەیە بۆچوونیان وایە کە دیاردەکە کەم ئەنجامدەدرێت.

ئەگەر بەراوردێك بکەین لەنێوان ئەم دوو گروپە تەمەن جیاوازەی سەرەوەدا ئەوا بۆمان دەردەکەوێت کە ڕێژەکانو بیروبۆچوونەکانیان زۆر نزیکە لەیەکەوەو ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ژنانی بەتەمەن چەندە کاریگەرییان لەسەر کچانی نەوەی نوێ هەیەو دواتر کچانی نەوەی نوێ نەیانتوانیوە پشت بەخۆیان ببەستن یان ئەو ڕۆحەیان بۆ دروستبێت، لەهەمانکاتدا نەیانتوانیوە لانی کەم شارەزاییان هەبێت لەسەر ئەو بوارانەی کە پەیوەندییان بەخۆیانەوە هەیە.

ئەو گروپەی کە تەمەنیان لەنێوان (١٩٨٥ بۆ ١٩٩٤) ژمارەی(٢٢٨) ژنەو (٢٥) ژنیان کە ڕێژەی(١٧,٤٪) پێیانوایە ئەم دیاردەیە زۆر ئەنجامدەدرێتو (٥٦) ژن (١٩,٩٪) لەوانە ئەم دیاردەیە زۆر کەم دەبینن‌و (٤١)ی تریش بەڕێژەی(١٤,٣٪) بەمامناوەند دەیبینن، (٥٧) ژن پییانوایە دیاردەکە بەڕێژەی(١٤,٩٪) هیچ ئەم دیاردەیە ئەنجامنادرێت، (٤٩) ژن(١٣,٥٪) پێیانوایە دیاردەکە کەمە.

ئەوانەی تەمەنیان لەنێوان(١٩٦٤ بۆ ١٩٥٥)دایە ژمارەیان (١٥٥) ژنەو(٢٣) ژن (١٦,٠٨٪ ) زۆر دیاردەکە دەبینن لەنێوان ژناندا (٣١) ژن(١١,٠٣٪) پێیانوایە دیاردەکە زۆر کەم ماوە لەکۆمەڵگادا، (١٨) ژنیش بەڕێژەی (٦,٣٪) مامناوەند دەیبینن(٤١) ژنیتر(١٠,٧٪) پێیانوایە دیاردەکە هیچ بوونی نییەو نەماوە (٤٢) ژنیتر لەوان(١١,٦٪) کەم ئەم دیاردەیە دەبینن.

ئەگەر سەرنج بدەین لەم دوو گروپە جیاوازەی سەرەوە ئەوا دەبینین تاکو تەمەنی ژنان گەورەتربێت ئەوا ڕێژەی خەتەنە بەرزدەبێتەوەو ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەوەی لەکۆندا ئەم دیاردەیە زۆربووەو کەم ژن هەبوویێت خەتەنە نەکرابێت،

بۆیە ئەوان کاریگەرییان لەسەر دیاردەکە هەیەو پێیانوایە کە دیاردەکە لەم ڕۆژەشدا بوونی هەیەو هەر ئەو ژنانە چارەنووسی کچانی ئەمڕۆش دیاریدەکەنو کاریگەریی ئەوانە لەسەر ئەوەی کە دەبێت کچان خەتەنە بکرێت، بۆیە گرنگە ژنانی بەتەمەن هۆشیار بکرێتەوەو خراپیی کرداری خەتەنەیان بۆ ڕوونبکرێتەوە بۆئەوەی چیتر هانی خەتەنەکردن نەدەن ئەوەی لەنێوان ژنانو نەوەی نوێدا.

**خشتەی ژمارە (أ-٦) پرسیاری بەڕای تۆ تا چەند ئە نجامدەدرێت؟**

**١-بە پێی ئاستی خوێندن**

| ئاستی خوێندن | ژمارە | تاچەندئەنجام دەدرێت ئێستا | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | زۆر | ڕێژە | زۆر کەم | ڕێژە | مام ناوەندی | ڕێژە | هیچ | ڕێژە | کەم | ڕێژە |
| نەخوێندەوار | ٣٠٨ | ٥٠ | ٪٢٨ | ٧٨ | ٪٢٤ | ٦١ | ٪٢٥ | ٤٩ | ٪١١ | ٧٠ | ٪٢٣ |
| خوێندن و نوسین | ٢١٧ | ٢١ | ٪١٢ | ٤٢ | ٪١٧ | ٣٩ | ٪١٦ | ٦٣ | ٪١٤ | ٥٢ | ١٧,٤ ٪ |
| سەرەتایی | ٣١٧ | ٤٥ | ٪٢٥ | ٨٢ | ٪٢٦ | ٦٧ | ٪٢٨ | ٧٢ | ٪١٦ | ٥١ | ٪١٧ |
| ناوەندی | ٢٩٣ | ٤٦ | ٪٢٦ | ٥٦ | ٪١٧ | ٤٧ | ٢٠٪ | ٨٣ | ٪١٧ | ٦٠ | ٪٢٠ |
| دواناوەندی | ٢٠٧ | ٨ | ٤,٥ ٪ | ٤٦ | ٪١٤ | ١١ | ٪٥ | ١٠١ | ٪٢٣ | ٤١ | ١٣,٦ ٪ |
| کۆلیج | ١٤٣ | ٥ | ٢,٨ ٪ | ٢١ | ٪٦ | ١٥ | ٪٦ | ٧٦ | ٪١٧ | ٢٦ | ٪٩ |
| کۆی گشتی | | ١٧٥ | ١٠٠ ٪ | ٣٢٥ | ٪١٠٠ | ٢٤٠ | ٪١٠٠ | ٤٤٤ | ٪١٠٠ | ٣٠٠ | ٪١٠٠ |




سەبارەت بەئاستی خوێندەواریی ژنانو بوونی دیاردە لەنێوان ژناندا خشتەی ژمارە (٥) ڕوونیدەکاتەوە:

ئەوەی جێی سەرنجە لەم خشتەیەدا بیخەینەڕوو ئەوەیە کە ئەو ژنانەی ئاستی خوێندەوارییان باشە دیاردەکە کەمدەبینن لەئێستادا، ئەمەش ئەوە دەردەخات کە لەو خێزانانەدا دیاردەکە زۆر کەمبۆتەوە، ئەمەش کاریگەریی ئاستی خوێندەواریی‌و ئاستی ڕۆشنبیریی دەردەخات لەسەر کەمبوونەوەی داب‌ونەریتە کۆنەکان بەتایبەتی ئەوانەی زەرەر بەکۆمەڵگاو مرۆڤایەتی دەگەیەنن، ئەوەتا لەکۆی (١٤٣) ژن کە ئاستی خوێندەوارییان لەکۆلێژدایە (٥)ژن کە(٢,٨٪)پێیانوایە دیاردەکە زۆرەو ئەو ژنانەی کە ئاستی خوێندەوارییان لەدواناوەندیدایە ژمارەیان (٢٠٧) دانەیە تەنها (٨)کە (٤,٥ ٪)لەوان دیاردەکە زۆر دەبینێت، لەئاستی ناوەندی ژناندا کە ژمارەیان (٢٩٣) ژنە (٤٦) ژن (٢٦٪) زۆر دەبینن، لێرەشدا دەبینین کە دیاردەکە ڕوولەزیادبوون دەکات، واتە تاکو ئاستی خوێندەواریی کەمبێتەوە پێیانوایە ئێستاش ڕێژەی خەتەنەکردن زۆرە. ئەوانەی کە ئاستی خوێندەوارییان لەکۆلێژدایە (٧٦)ژن کە ڕێژەی (١٧٪) پێیانوایە دیاردەکە هیچ نییەو ئەو ژنانەی کە ئاستی خوێندەوارییان لەدواناوەندیدایە (١٠١) کە(٢٣٪) لەوان دیاردەکە نییە دەبینێت‌و لەئاستی ناوەندی ژناندا کە ژمارەیان (٨٣ )ژنە (١٧٪) ئەڵێن هیچ ناکرێ، (٧٢)سەرەتایی ڕێژەی(١٦٪)لێرەشدا دەبینین کە تاکو ئاستی خوێندەواریی بەرزتربێت پێیانوایە ئێستا ڕێژەی خەتەنەکردن هیچ نییەو ناکرێت، کەواتە ئەگەر بەراوردی ئەم دوو جۆری گروپە بکەین وەڵامدانەوەکان بکەین تا ئاستی ڕۆشنبیریی زیاتربێت پێیانوایە دیاردەی خەتەنەکردن کەمبۆتەوە یان هەر ناکرێت‌و بەپێچەوانەشەوە.

## خشتەی ژمارە (أ-٦) پرسیاری بەڕای تۆ تا چەند ئە نجامدەدرێت؟

## ١-بە پێی شوێنی نیشتەجێبوون

| شوێنی نیشتەجی ّبوون | تاچەندئەنجام دەدرێت ئێستا | | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | کۆ | زۆر | ڕێژە | زۆرکەم | ڕێژە | کەم | ڕێژە | مام ناوەندی | ڕێژە | هیچ | ڕێژە |
| شار | ٥٥٠ | ٨٣ | ٪ ٣٥,٩ | ١١٢ | ٪ ٣٨,٦ | ١٢٢ | ٪ ٣٦,٤ | ١٠١ | ٪ ٣٤,٧ | ١٣٢ | ٪ ٣٨,٢ |
| شارۆچکە | ٥٤٦ | ٨٧ | ٪ ٣٧,٦ | ١٠٨ | ٪ ٣٧,١ | ١٣١ | ٣٩٪ | ١٠٥ | ٣٦٪ | ١٢٤ | ٪ ٣٥,٨ |
| لادێ | ٣٨٩ | ٦١ | ٪ ٢٦,٥ | ٧١ | ٪ ٢٤,٣ | ٨٢ | ٪ ٢٤،٦ | ٨٥ | ٪ ٢٩,٣ | ٩٠ | ٢٦٪ |
| کۆ | ١٤٨٥ | ٢٣١ | ١٠٠٪ | ٢٩١ | ١٠٠٪ | ٣٣٥ | ٪ ١٠٠ | ٢٩١ | ١٠٠٪ | ٣٤٦ | ٪ ١٠٠ |
| **ڕێژەی گشتی** | | **١١,٥ ٪٠** | | **٢٠,٦ ٪٠** | | **٪٦ ٢٠,٤** | | **١٦,٧٠ ٪** | | **٣٠, ٪١٠** | |










سەبارەت بەشوێنی نیشتەجێبوونو پرسیار لەئێستا تاچەند خەتەنە بوونی هەیە لەنێو ژناندا ئەوا لەخشتەی ژمارە(٥)دا وەڵامی بەدیدەکەین:

ئەو ژنانەی کە لەشاردان ژمارەیان (٥٥٠) ژنەو لەوانە (٨٣)ژن دیاردەکە زۆردەبینێت کە ڕێژەی (٣٥,٩٪)، (١١٢) ژنیش (٣٨,٦٪)زۆر کەم دیاردەکە بەدیدەکەن، (١٢٢) ژنیتر کە ڕێژەی (٣٦,٤٪) پێیانوایە دیاردەکە کەمبۆتەوەو (١٠١)ژن (٣٤,٧٪) لەوانە بەشێوەیەکی مامناوەند دەیبینن و (١٣٢) کە ڕێژەی (٣٨,٢٪)هەستدەکەن کە دیاردەکە هیچ بوونی نەماوە، بەڵام ئەو ژنانەی کە لەشارۆچکەکاندا دەژین ژمارەیان (٥٤٦) ژنە (٨٧)ژن کە ڕێژەی (٣٧,٦٪) پێیانوایە دیاردەکە زۆرەو (١٠٨) ژن(٣٧,١٪) لەوانە دیاردەکە زۆر کەمدەبینن (١٣١) ژنیتر (٣٩٪) دیاردەکە کەمدەبینن و (١٠٥) ژن لەوانە (٣٦٪) دیاردەکە بەڕێژەی مامناوەندی بەدیدەکەن، (١٢٤) ژنیتر (٣٥,٨٪) هەستدەکەن دیاردەکە هیچ بوونی نەماوە.

لێرەدا ئەوە بەدیدەکەین کە جیاوازیی نێوان ژنانی شـارو شارۆچـکەکان جیاوازییـەکی کەمـە، ئەمـەش ئـەوە دەردەخات کە تێڕوانینی ژنانی شار بۆ دیاردەکە هەمان تێڕوانینی ژنانی شارۆچـکەکانە کـە ئەمـەش بۆخـۆی جێی پرسیارە سەبارەت بەژنانی لادێ کە ژمارەیان(٣٨٩) ژنە (٦١)ژن (٢٦,٥٪) پێیانوایـە دیاردەکـە زۆرەو (٧١) ژن (٢٤,٣٪) دیاردەکە زۆر کەم بەدیدەکەن (٨٢) ژن لەوان (٢٤،٦٪) کـەم دیاردەکـە دەبیـنن، (٨٥) ژنیتر (٢٩,٣٪) بەڕێژەی مامناوەند (٩٠)ژن (٢٦٪) لەوان پێیانوایە دیاردەکە هیچ بوونی نەماوە.

**خشتەی ژمارە (أ-٧) پرسیاری ئایا لەچ تەمەنێکدا خەتەنەکراوە؟ بە پێی شوێنی نیشتەجێبوون**

| تەمەنی خەتەنەکردن | کـۆی گشتی | ڕێـــژەی گشتی | شوێنی نیشتەجێبوون | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | شار | ڕێژە | شارۆچکە | ڕێژە | لادێ | ڕێژە |
| ساڵ بەرەوخوار 6 | ٥٩١ | ٦٢٪ | 214 | 79% | 207 | 69% | 170 | 80% |
| 12_7 | ١٧٢ | ٢٠٪ | 52 | 19% | 80 | 27% | 40 | 19% |
| 18_13 | ١٩ | ٢٪ | 5 | 2% | 12 | 4% | 2 | 1% |
| 18وزیاتر | ٠ | ٠٪ | 0 | 0% | 0 | 0% | 0 | 0% |
| کۆ | ٩٦٢ | ١٠٪ | 271 | ١٠٠٪ | 299 | 100% | 212 | 100% |




لەخشتەی ژمارە (أ-٧)دا ئەوە ڕوونکراوەتەوە کە شوێنی نیشتەجێبوونی ژنان بڕوای ئەوان بۆ ئەوەی کـە ئایـا ژنان لەچ تەمەنێکدا خەتەنە دەکرێن.

لەم خشتەیەی سەرەوەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە زۆرترین ژن کە خەتەنە دەکرێن لەتەمەنی شەش ساڵ بەرەوخوارە ئەمەش هۆکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەو کەسە لەو تەمەنەدا منداڵەو توانای بەرگریکردنی لەخۆی نییەو بەئاسانی دەتوانێت ئەو منداڵە کۆنترۆڵبکرێتو مافی پێشێلبکرێت، بۆیە لەکۆی (٥٥٠) ژن کە لەشاردا نیشتەجێن (٢١٤) ژنن (٧٩٪)پێیوایە لەتەمەنی (شەش ساڵ بەرەوخوار )خەتەنەکراونو (٥٢) ژنیش (١٩٪) لەوان پێیانوایە لەتەمەنی(٧بۆ١٢ ساڵ) کارەیان بۆ ئەنجامدەدرێتو (٥) ژنیش ٢٪لایان وایە لەتەمەنی( ١٣ بۆ ١٨ ساڵ )ئەنجام دراوە ،( ٢٧٩) ژن لەوانیش هیچ زانیاریەکیان نەداوە کەئەمەش دەکرێت بۆ کۆمەڵێك هۆکار بگەڕێتەوە.

سەبارەت بەو ژنانەی کە لەشارۆچکەکاندا دەژین لەکۆی (٥٤٦)ژن (٢٠٧) ژن (٦٩٪) پێیانوایە لەتەمەنی(٦ ساڵ بەرەو خوار) بۆیان ئەنجامدراوەو (٨٠) ژنیتر (٢٧٪) پێیانوایە لەتەمەنی (٧بۆ١٢ ساڵ) ئەنجامدراوەو (١٢) ژن (٤٪) لەوان پێیانوایە کە لەتەمەنی(١٣ بۆ ١٨ ساڵ) ئەنجامدەدرێت، لەنێوان ژنانی شارۆچکەکانیشدا لەکۆی(٥٤٦) ژن(٢٤٧) ژن هیچ وەڵامێکیان دیارینەکردووە.

لای ژنانی لادێ کە ژمارەیان (٣٨٩) ژن بووە (١٧٠) ژن (٨٠٪) لەوان پێیانوایە لەتەمەنی (٦ ساڵ بەرەوخوار) خەتەنەکردن بۆ کچان ئەنجامدەدرێتو (٤٠)ژنیتر (١٩٪) پێیانوایە لەتەمەنی (٧بۆ١٢ ساڵ) ئەنجامدەدرێتو (٢) ژن (١٪) لەوان پێیانوایە کە لەتەمەنی (١٣ بۆ ١٨ ساڵ) ئەنجامدەدرێت، لەم خشتەیەشدا لەکۆی (٣٨٩) ژن (٢١٣) ژن بێ وەڵامن کە ئەمەش ڕێژەیەکی بەرزترە لەچاو شاروشارۆچکەکاندا، ئەوەی مایەی سەرسوڕمانە لێرەدا ئەوەیە کە زۆرترین وەڵام لای ژنانی شارۆچکەکان بووە ئەو ژنانە هەستکردن بەبەرپرسیارێتی لایان زیاترە لەژنانی شارولادێ بەرامبەر بەکاری لێکۆڵینەوە زانستییەکان، لەهەمانکاتدا ژنان بەگشتی ئەو هەستەیان لاوازە کە هاوکاریی کارێکی زانستی بکەن بۆئەوەی کێشەکانیان بخاتەڕوو باسو لێکۆڵینەوەو بڕوایان بەوە لاوازە کە مافەکانیان بۆ وەربگرێتەوە. لێرەشدا دەکرێت ئەوە بوترێت کە کاری زانستی لەم وڵاتەدا هێندە کەمەو لەهەمانکاتدا ئەوەش دەردەکەوێت کە چینوتوێژەکانی کۆمەڵگای کورد یاریدەدەری باش نین بۆئەوەی کێشەکانمان بەشێوەی زانستی بخرێتەڕوو چارەسەر بکرێت.

**خشتەی ژمارە (أ-٨)**

**پرسیاری ئەگەر کچت هەیە خەتەنەی دەکەیت؟ بە پێی ئاستی خوێندن**

| ئاستی خوێندن | کچەکەی خەتەنە دەکات؟ | | | | کۆی گشتی |
|---|---|---|---|---|---|
| | بەڵێ | ڕێژە | نەخێر | ڕێژە | |
| نەخوێندەوار | ٩٠ | ٪٣٣ | ٢١٨ | ٪١٩ | ٣٠٨ |
| خوێندن و نوسین | ٨٨ | ٪٣٢ | ١٢٩ | ٪١١ | ٢١٧ |
| سەرەتایی | ٥١ | ٪١٩ | ٢٦٦ | ٪٢٢ | ٣١٧ |
| ناوەندی | ٢١ | ٪٨ | ٢٧٢ | ٪٢٣ | ٢٩٣ |
| دواناوەندی | ١٢ | ٪٤ | ١٥٥ | ٪١٣ | ١٦٧ |
| کۆلیج | ١٠ | ٪٧ | ١٣٢ | ٪١٢ | ١٤٣ |
| کـــــــۆی گـــشــــــــتی | | | | | ١٤٤٥ |




**ئاستی خوێندنی ژنانو پرسیاری ئایا کچەکەی خەتەنەدەکات**

ئەو ژنانەی نەخوێندەوارن ڕێژەیان (٣٠٨) ژنــەو لەوانــە (٩٠) ژن،(٣٣٪) ئێـستاش ئامادەییـان تێدایــە کــە کچەکانیان خەتەنە بکـەنو (٢١٨) ژن (١٨٪) ئامادەییـان تێدانییــە کــە ئــەم کــارە بەرامبــەر کــچەکانیان

ئەنجامبدەن، ئەو ژنانــەی کــە ئاســتی خوێنــدنو نووســینیان هەیــە ژمارەیــان (٢١٧) ژنو (٨٨) ژن (٣٢٪) ئامادەییان تێدایە کە کچەکانیان خەتەنەبکەنو (١٢٩) ژن (١١٪) ئامادەییان تێدانییە ئەم کارە بەمــشێوەیە ئەنجامبدەن بۆ کچەکانیان، بەڵام ئەو ژنانەی کە ئاستی خوێندەوارییان سـەرەتاییە (٣١٧) ژنــەو (٥١) ژنیـان (١٩٪) ئامادەن کچەکانیان خەتەنەبکەنو (٢٦٦) ژنیان (٢٢٪) لەوان ئەم کارە ناکەن، سەبارەت بەوانەی کە ئاستی خوێندەوارییان ناوەندییــە ژمارەیــان (٢٩٣) ژنــەو (٢١ )ژن (٨٪) لــەوان کــچەکانیان خەتەنەدەکــەن (٢٧٢)ژن (٢٣٪) ئەم کارە ناکەن، ئەو ژنانەی کە ئاستی خوێندەوارییان دواناوەندییــە (٢٠٧)ژنــن (١٢) ژن (٤٪) کچەکانیان خەتەنەدەکەنو (١٥٥) ژن (١٣٪) ئەم کارە ناکەنو (٤٠) ژن لەوان هیچ وەڵامێکیان نەبووە بۆ پرسیارەکەو پێدەچێت ئەمەش لەوەوە هاتبێت کە کرداری خەتەنەکردنی ژنــان نهێنییــەو دەبێــت ئــەمانیش بەنهێنی ئەم کارە بکەن لەداهاتوودا بـۆ کـچەکانیان سـەبارەت بـەو ژنانـە کـە خوێنـدەواریی یـان لەئاسـتی کۆلێژدایە ژمارەیان ١٤٣ ژنــەو (١٠) ژن (٧٪) ئامادەیــە کــە هــەمان کــردار بــۆ کــچەکانیان ئەنجامبــدەن (١٣٢)ژنیش (١٢٪) ئامادە نین ئەم کارە بکەن، بەگــشتی ئاســتی خوێنــدەواریی کاریگــەریی هەیــە لەســەر کەمکردنەوەو بچوککردنەوەی دیاردەی خەتەنە لەنێو کچاندا، بەڵام کێشەکە لێرەدایە کــەم نــین ئــەو ژمارانــە لەهەموو ئاســتەکانی خوێندنــدا بەدیــدەکرا لــەنێو خشتەکەدا کــە بڕیــار دەدەن لــەداهاتوودا خەتەنەکــە بــۆ کچەکانیان ئەنجامبدەن، بۆیە لێرەدا دەکرێت قەبارەی دیاردەکە لەداهاتوودا ببینین، بۆیــە پێویــستە بەجــددیی هەوڵبدرێت بۆ ڕێگرتن لەو ژنانەی کە کاری خەتەنە بۆ کــچەکانیان ئەنجامــدەدەن، ئەمــەش لەلایــەنی یەکــەم دەکەوێتە سەرشانی ڕێکخراوەکانی ژنانو حکومەت.

### خشتەی ژمارە (أ-٩) سەبارەت بەو پرسیارەی کەئایا کێ خەتەنەی کردووە؟

| خەتەنەکراویت | کێ خەتەنەی کردویت ؟ | | | |
|---|---|---|---|---|
| | پزیشك | مامان | هی تر | ژمارە |
| بەڵێ | ١٥ | ٤٥٤ | ٢٢٥ | ٦٩٤ |
| ڕێژە | ١,٩٪ | ٪٦٥,٩٠ | ٣٢,٣٪ | ١٠٠٪ |




کۆی ئەو ژنانەی کە وەڵامیان داوەتەوە ژمارەیــان (٦٩٤)ژنــە لــە کــۆی (١٤٨٥) ژنــە کــە ئــستیبیانەکانیان بەسەردا دابەشکراوەو (١٥)ژن (١,٩٪) پزیشك ئەم کارەی بۆ ئەنجامداوەو (٤٥٤) ژنیش (٦٥,٩٠٪) مامــان

کرداری خەتەنەکەی بۆ ئەنجامداوە، (٢٢٥) ژنیش (٣٢,٣٪) کەسانیتر ئـەم کارەیـان ئەنجامـداوە، (٧٩١) ژن هیچ وەڵامێکیان بۆ ئەم پرسیارە نەبووەو دەکرێت ئەمەش بگەڕێتـەوە بـۆ ئـەوەی لەمناڵیـدا ئـەم کـارەی بـۆ ئەنجامدراوەو هیچ زانیارییەکی لەسەرنییە، بەڵام ئەوەی کەجێی سەرنجە لەم خـشتەیەدا ئەوەیـە کـە پزیـشكو مامان ئەوانەن کە مۆڵەتی رسمی پیشەکەیان هەیەو دیارە بەرەسمی ئـەم کـارە ئەنجامـدەدەنو رێکخراوەکـانی ژنانو ژنانی رۆشنبیر نەیانتوانیوە ئەم کارە بەرەسمی قەدەغەبکەن یان لانی کەم کاریگـەرییان هـەبێت لەسـەر پزیشكو مامانەکان کە ئەم کارە نەکەن بۆ هیچ کەسێك، لەهەمانکاتدا خشتەکە ئەوە دەردەخات کە (٣٢٪)ی ئەو ژنانەی کە خەتەنەیان بۆکراوە کەسانی تر کردارەکەیان ئەنجامداوە، ئەمانیش شارەزاییان نییە لەم بوارەداو ئەمەش زیانە تەندروستییەکان بۆ ژنان زیاتردەکـات، چـونکە زۆر بڕینـی قیتکـە دەبێتـەهۆی ئـەوەی زیـانی دەروونییو تەندروستی زۆرتربێت لەلای ئەو ژنانە کە بەتـەواویی تووشـی سـاردیی سێکـسی دەبـنو ئەمـەش دەکرێت کێشەی خێزانیی لێبکەوێتەوەو دەبێتەهۆی هەڵوەشاندنەوەی خێزان.

**خشتەی ژمارە (أ -١٠) ئایا شووی کردووە وخەتەنەکراوە؟**

| شووی کردووە | ژمارەی شوویکردووە | خەتەنەکراوە | |
|---|---|---|---|
| | | بەڵێ | نەخێر |
| ژمارە | ٧٣٦ | ٤٧٦ | ٢٦٠ |
| رێژە | ١٠٠٪ | ٦٥٪ | ٣٥٪ |

لەم خشتەیەدا ئەوە دەردەخات کە لە (١٤٨٥) فۆرم ژمارەی ئەوانەی شوویانکردووە (٧٣٦) ژنن کە (٤٧٦) کە رێژەی (٦٥٪)ی خەتەنەکراوە کە ئەمەش رێژەی زۆرینەی زۆری ژنەکان کرداری خەتەنەیان بۆ ئەنجامدراوەو ئەوانەی خەتەنەنەکراون ژمارەیان (٢٦٠)ن کە رێژەی (٣٥٪) لێرەدا ئەو پرسیارەیان ئاراستەکراوە ئایا خەتەنەکردنەکە هیچ کاریگەریی هەبووە بۆجنس تایبەت بەو ژنانەی شوویانکردووەو خەتەنەکراون.

| شووی کردووەوخەتەنەکراوە | ژمارە | خەتەنەکردنەکە هیچ کاریگەری هەبووە بۆجنس | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| | | بەڵێ | رێژە | نەخێر | رێژە |
| بەڵێ | ٤٧٦ | ٢٧٣ | ٥٧,٣٪ | ٢٠٣ | ٪٤٢,٧ |




**خشتەی ژمارە (١٠) سەبارەت بەپرسیاری ١١ شوویکردوەو ئایا خەتەنەکردنەکە هیچ کاریگەرییەکی هەبووە بۆجنس.**

لەم خشتەیەدا ئەوەمان بۆ روونەدبێتەوە کە ژمارەی ئەو ژنانەی کە شویانکردووە (٧٣٦) ژنن کە (٤٧٦)ژنیان خەتەنەکراونو تەنها (٢٧٣) ژن کە رێژەیان (٥٧,٣٪)یە پێیانوایە کاریگەریی هەیە لەسەر کرداری جووتبوونو رێگرە لەبەردەم گەیشتن بەلوتکەی خۆشی (ئۆرجازم) یان دواکەوتنی، بەلاّم رێژەی (٢٠٠) ژن لەوان هیچ کاریگەریی نابینن، ئەمەش مایەی سەرسوڕمانە، لەکاتێکدا میتکە بەشێکی گرنگی وروژاندنی سێکسەو پێدەچێت ئەم ژنانە رۆشنبیریی سێکسییان لاوازبێت بەرادەیەك کە هەست نەکەن کە کرداری خەتەنە کاریگەریی خراپیی نییە بۆ جووتبون.

**خشتەی ژمارە (أ- ١١) پرسیاری ئەوەی شوویکردووەو ئایا خەتەنە کاریگەریی هەیە لەسەر باری دەروونیی.**

| شووی کردوە | کاریگەریی هەیە لەڕووی دەروونیی | ژمارە | ڕێژە |
|---|---|---|---|
| ٧٣٦ | بەڵێ | ٢٥٣ | ٣٤,٤٪ |
| | نەخێر | ٤٨٣ | ٦٥,٦٪ |
| ڕێژە | ١٠٠٪ | | |




ئەو ژنانەی کە شوویانکردووە (٧٣٦) ژنەو (٢٥٣) ژن کە ڕێژەی (٣٤,٤٪) لایانوایە کاریگەریی هەیە لەسەر باری دەروونیی‌و (٤٨٣) ژن کە ڕێژەی (٦٥,٦٪) پێیانوایە کە بڕینی میتکە هیچ کاریگەرییەکی دەروونیی نییە، ئەمەش ئەوە دەردەخات کە ژنان زانیارییان زۆر کەمە لەوبارەیەوەو وەك ئاشکرایە زانست ئەوەی سەلماندووە کە بڕینی میتکە زۆر ڕۆڵی هەیە لەکرداری سێکس‌و هەر ئەم بڕینەش دەبێتەهۆی ئەوەی کە حەزی سێکس لای ژن کەمبێتەوە، ساردیی سێکسی لێدەکەوێتەوە، دواتر ژن بەهۆی ئەم کردارەوە تووشی خەمۆکیی‌و دڵەڕاوکێ‌و ترس دەبێت‌و تووشی تاسانی دەروونیی دەبێ، ئەمانەش هەمووی کاریگەریی خراپی هەیە بۆ سەر کەسێتی ژن‌و ژیانی خێزان.

**فۆرمی( ب ) ئاماری ئاستی رۆشنبیریی لەسەر خەتەنەکردنو نموونەی مامانەکانن کە ژمارەیان ( ١٠٠ ) فۆرمە**

خشتەی ژمارە (ب-١) ئاستی خوێندنی مامان

| ئاستی خوێندن | ژمارە | ڕێژە |
|---|---|---|
| نەخوێندەوار | 78 | %٧٨ |
| خوێندن و نوسین | 9 | %٩ |
| سەرەتایی | 7 | %٧ |
| ناوەندی | 6 | %٦ |
| کۆی گشتی | 100 | 100% |




**خشتەی ژمارە( ب--١) ئاستی خوێندنی مامانەکان دەردەخات:**

ئەو مامانانەی نەخوێندەوارن زۆرترین ڕێژەکە (٧٨٪) پێکدێنن، کە ئاستی خوێندنیان خوێندنو نووسینەو ڕێژەیان (٩٪) بەشێکی تریان ئاستی سەرەتاییان هەیە کە بەرێژەی (٧٪) پێکدێننو ئەوانەی ئاستی خوێندنیان ناوەندییە ڕێژەی (٦٪) پێکدێنن، بەمەش دەردەکەوێت زۆرترین ڕێژەی مامانەکان نەخوێندەوارنو لەهەمانکاتدا ئەم مامانانە ژیانی زۆرێك لەئافرەتانی کوردیان بەدەستەو ئێستەش کەم نین ئەوانەی لەگوندو شارو شارۆچکەداو تەنانەت لەشارەکاندا پشت بەمامانەکان دەبەستن لەکاتی دووگیانییو دواتر هەر ئەمانە کاری خەتەنە ئەنجامدەدەن، بۆیە مایەی سەرسوڕمانە کە ڕێژەیەکی زۆر لەمانە مۆڵەتی وەزارەتی تەندروستی وەردەگرن بەبێ ئەوەی ڕەچاوی ئاستی خوێندنی بکەن، ئەمەش بەم خشتەیەی خوارەوەدا دەردەکەوێت کە لەکۆی (١٠٠)مامان ژمارەی زۆری (٨٨) مامان مۆڵەتی مامانی وەرگرتووەو تەنها (١٢) مامان مۆڵەتی مامانی وەرنەگرتووە.

**خشتەی ژمارە ( ب -٢ ) ئەو مامانانەی مۆڵەتی ڕەسمییان وەرگرتووە**

| مۆڵەتی مامانی وەرگرتووە | ژمارە | ڕێژە |
|---|---|---|
| بەڵێ | 88 | ٨٨٪ |
| نەخێر | ٢١ | ١٢٪ |
| کۆیگشتی | 100 | ٪١٠٠ |




لەم خشتەیەدا ئەوە ڕووندەبێتەوە کە لەژمارەی (١٠٠) مامان (٨٨) مامانیان کە ڕێژەی (٨٨٪) دەکات مۆڵەتی ڕەسمی وەرگرتووە، تەنها (١٢) مامان کە ڕێژەی (١٢٪) دەکات بەشێوەی نارەسمی کە پێیاندەوترێت مامانی لاکۆڵان تائێستا کاری مامانی دەکەن.

کە ئەمەش بۆخۆی پرسیارێکە بۆ دامودەزگا تەندروستییەکان کە ئێستاش مامان هەیە بێ مۆڵەت کاردەکات کە ئەمەش مەترسییە بۆسەر ژیانی ژنان.

**خشتەی ژمارە (ب-٣)سەبارەت بە پرسیاری ئایا کاری خەتەنەی ئەنجامداوە دەریدەخات:**

| ڕێژە | کۆ | کاری خەتەنەکردنت ئەنجامداوە |
|---|---|---|
| 60% | 60 | بەڵێ |
| 40% | 40 | نەخێر |
| 100% | 100 | کۆیگشتی |




**سەبارەت بەپرسیاری ئایا کاری خەتەنەی ئەنجامداوە دەریدەخات:**

ئەوانەی خەتەنەیانکردووە (٦٠٪) ڕێژەکە پێکدەهێنن و (٤٠٪) ئەم کارەی ئەنجام نەداوە لێرەوە دەردەکەوێت زۆرترین ڕێژە کاری خەتەنەی ئەنجامداوە، ئەمەش دەریدەخات کە مامانەکان لەڕابردوودا کاری خەتەنەیان ئەنجامداوە.

**خشتەی ژمارە ( ب -٤ ) سەبارەت بە پرسیاری ئایا کاری خەتەنەی ئەنجامداوە بە پێی شوێنی نیشتەجێبوون:**

| شوێنی نیشتەجێبوون | کۆ | خەتەنەی کردووە | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| | | نەخێر | ڕێژە | بەڵێ | ڕێژە |
| شار | 43 | 19 | ٤٨٪ | ٢٤ | ٤٠٪ |
| شارۆچکە | 41 | 16 | ٤٠٪ | ٢٥ | ٤٢٪ |
| لادێ | 16 | 5 | ١٣٪ | ١١ | ١٨٪ |
| کۆیگشتی | 100 | 40 | ١٠٠٪ | ٦٠ | ١٠٠٪ |




ئەم خشتەیە ئەوە دەردەخات کە ڕێژەی خەتەنەکردن کە مامانەکان ئەنجامیانداوە دەرکەوتووە لەشار (٤٨٪)مامان خەتەنەی کردووەو (٤٠٪) وتویانە نەخێر نەمان کردوویانە، لەشارۆچکە (٤٠٪) خەتەنەی ئەنجام نەداوەو (٤٢٪) بەنەخێر وەڵامی داوەتەوە، لەلادێ (٢١٪) خەتەنەی کردووەو (١٨٪) وتویانە کردوومانە، ئەوەی گرنگە کە بوترێت لێرەدا ئەوەیە کە مامانەکانی نیشتەجێی شارن زۆرترن ڕێژەیە لەچاو شارۆچکەو لادێکاندا کە کاری خەتەنەیان ئەنجام نەداوەو لەهەمانکاتدا ئەو ڕێژەیەش زۆرە کە کاری خەتەنەکردنیان ئەنجامداوە لەشاردا، کەواتە لێرەدا ئەوەمان بۆ دەردەخات کە لەگەڵ ئەوەی ئاستی خوێندنی مامانەکان نزمە، بەڵام کرانەوەی شارەکان بەڕووی یەکتردا ئەتوانرێت ژیانی باشتر ڕێکبخرێتو ژیانێکی پێشکەوتووتر بنیاتبنێت، ئەمەش یەکدەگرێتەوە لەگەڵ خشتەی ژمارە(٤) لەفۆرمی (أ)دا لەگەڵ پرسیاری ئایا خەتەنەکراویت بەپێی شوێنی نیشتەجێبوونی نموونەی توێژینەوەکە.

**خشتەی (ب -٥)ئەو شوێنەی کە کاری خەتەنەکردنیان ئە نجامداوە**

| شوێنی نیشتەجێبوونی ئیستا | کۆ | خەتەنەی کردووە | شوێنی ئەنجامدانی کرداری خەتەنەکردن | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | شار | ڕێژە | شارۆچکە | ڕێژە | لادێ | ڕێژە |
| شار | 43 | ٢٤ | ٥ | ٧١٪ | 10 | ٤٣٪ | 9 | ٣٠٪ |
| شارۆچکە | 41 | ٢٥ | 2 | ٢٩٪ | 10 | ٤٣٪ | 13 | ٤٣٪ |
| لادێ | 16 | ١١ | ٠ | ٠٪ | ٣ | ١٤٪ | ٨ | ٢٧٪ |
| کۆی گشتی | 100 | ٦٠ | ٧ | ١٠٠٪ | ٣٢ | ١٠٠ | ٣٠ | ١٠٠ |




لێرەدا ئەوەی لەخشتەی (ب -5)دا دەرکەوتووە لەم خشتەیەدا ئەوەیە کە ئەو مامانانەی شوێنی نیشتەجێبونیان شارە لە (٤٣) مامان ئەوانەی خەتەنەیان کردووە بریتین لە(٢٤)مامان لەشوێنە جیاجیاکان کاری خەتەنەیان کردووە کە تەنها لە(٥) ڕێژەی (71٪) لەم مامانانە لەناوشاردا ئەم کارەی ئەنجامداوە لەگەڵ ئەوەی کە (١٠)یان (43٪) لەشارۆچکەو لە(٩)ی (30٪)لەلادێکاندا خەتەنەی ئەنجامداوەو بەهەمانشێوە ئەوانەی دانیشتووی شارۆچکەن بریتین لە(٤١) مامان کە ئەوانەی خەتەنەیانکردووە (٢٥) مامانن‌و تەنها (٢) مامان (٢٩٪) لەناوشار کاری خەتەنەیان کردووە، بەڵام لەشارۆچکەدا (١٠) (43٪)ی مامانەکان لەلادێکاندا (١٣)کە ڕێژەی (43٪)خەتەنەی کچانیان کردووە واتە ئەوانەی دانیشتوی شارۆچکەن یان لەناو شارۆچکەکاندا کاری خەتەنەیان کردووە یان لەلادێکاندا ڕێژەیەکی کەمیان هاتوونەتە شار، بەڵام ئەوانەی دانیشتوی لادێن کە (١٦) مامانن کە (١١) مامان خەتەنەیان کردووەو (27٪)ی ئەم مامانانە لەلادێکاندا کاری خەتەنەیان کردووەو ڕێژەی (١٤٪) لەشارۆچکەدا ئەم کارەیانکردووەو ڕێژەی (سفر٪) واتە هیچ کام لەم مامانانە لەلادێوە نەهاتوونەتە شار بۆکاری خەتەنە، بەڵکو ئەمانیش وەك دانیشتوی شارۆچکەکان لەلادێکان‌و شارۆچکەدا خەتەنەیان کردووە.

**خشتەی ( ب -٦ )تەمەنی خەتەنەکردن چەندبووە؟**

| تەمەنی خەتەنەکردن | خەتەنەکردنت ئەنجامداوە | | | |
|---|---|---|---|---|
| | بەڵێ | ڕێژە | نەخێر | ڕێژە |
| ٥ساڵو کەمتر | 40 | 67% | 20 | 50% |
| ١٠_٥ | 14 | 23% | 17 | 43% |
| ١٥_١٠ | 2 | 7% | 1 | 3% |
| ١٥و زیاتر | 0 | 3% | 0 | 0% |
| نازانم | | 0% | 2 | 4% |
| کۆ | ٥٦ | 100% | ٤٠ | 100% |




خشتەی ژمارە ( ب-٦) ئەوەمان بۆ دەردەخات ئەو کچانەی خەتەنەکراون لەلایەن مامانەکانەوە تەمەنیان چەندبووە:

لەخشتەکەدا دەردەکەوێت کاتی خەتەنەکردنی کچان لەتەمەنی زۆر منداڵدا بەئەو مامانانەی کە خەتەنەیانکردووەو تەمەنی خەتەنەکەیان دیاریکردووە بەمشێوەیەیە:- (٤٠) ڕێژەی (٧٦٪) کچان تەمەنیان

لەخوار (٥)ساڵییەوەیەو ئەو کچانەی تەمەنیان لە(٥-١٠) ساڵ بووە ژمارەیان (١٤) ڕێژەی (23٪) پێکدێنن کە لەم تەمەنەدا مامانەکان خەتەنەیان کردووەو ئەو کچانەی تەمەنیان (١٠-١٥) ساڵ بووە (٤) ڕێژەی (٧٪) پێکدێنن، ئەوانەی تەمەنیان لە(١٥زیاتر) ڕێژەی (٣٪)و لەم تەمەنەدا خەتەنەیان بۆکراوە، ڕێژەی ئەو مامانانەی کە خەتەنەیان نەکردووەو بەبڕوای ئەوان بەمشێوەیە کراوە تەمەنەکەیان دیاریکردووە (20) مامان ڕێژەی (٥٠٪) کچان کە خەتەنەیان بۆکراوەو تەمەنیان لەخوار (٥) ساڵییەوەیەو ئەو کچانەی تەمەنیان لە(٥-١٠) ساڵ بووە ژمارەیان (17)ڕێژەی (٤٣٪) پێکدێننو ئەو کچانەی تەمەنیان (١٠-١٥) ساڵ بووە (١) ڕێژەی (٢,٥٪) پێکدێننو ئەو کچانەی تەمەنیان لە(١٥زیاتر) کەسیان دیارینەکردووە کە ڕێژەی (سفر٪)و نازانم(٤٪) کە ئەم ڕێژەیە لەمامانەکان نەیانوویستووە ئەو تەمەنە بڵێن کە کچەکانیان تێدا خەتەنەکراوە ئەوەی گرنگە باسی بکەین لێرەدا ئەوەیە کە زۆرترین ئەو کچانەی خەتەنەدەکرێن تەمەنیان زۆر منداڵە کە بەویستی خۆی نییەو باشتر کۆنترۆڵدەکرێن بۆ ئەوەی ئەم کارەی بۆ ئەنجامبدرێت.

**خشتەی ژمارە ( ب - ٧ )**

**سەبارەت بەوەڵامی ئەوانەی مامانەکان بۆ پرسیاری ئایا ئێستا تاچەند ئە نجامدەدرێت:**

| تاچەند ئەنجامدەدرێت ئێستا | شوێنی نیشتەجێبوونی ئیستا | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | شار | ڕێژە | شارۆچکە | ڕێژە | لادێ | ڕێژە |
| زۆر | 0 | 0% | 1 | 2,7% | 0 | ٠ |
| مامناوەند | 3 | 5,8% | 15 | 40,5% | 1 | ٨,٣٪ |
| کەم | 37 | 72,5% | 11 | 29,7% | 9 | ٧٥٪ |
| هیچ | 6 | 11,7% | 10 | 27,2% | 2 | ١٦,٦٪ |
| نازانم | 2 | 3,9% | 0 | 0 | 0 | ٠ |
| وەڵامیان نەداوەتەوە | 3 | 5,8% | 0 | 0 | 0 | 0 |
| | 51 | 100% | 37 | 100% | 12 | 100% |




خشتەی ژمارە (ب - ٧)

سەبارەت بەوەڵامی ئەوانەی مامانەکان بۆ پرسیاری ئایا ئێستا تاچەند ئەنجامدەدرێت:

(٥١) مامان دانیشتوی شارن، لەم ژمارەیەش (٥,٨٪) کەس وەڵامیان نەداوەتەوە، کەسیان نەیانوتووە زۆرە، (٧٢,٥٪) مامان دەڵێن ئێستا کەمە، (٥,٨٪) مامان وتویانە مامناوەندیە، (٣,٩ ٪) مامان دەڵێن نازانین، تەنها (١١,٧٪) مامان وەڵامیان ئەوەیە هیچ نییە ئێستا ماوەتەوە، لێرەدا ئەوەی دەرکەوتووە (٧٢,٥٪)مامان لە (٥١) مامانو دانیشتوی شارن ئەڵێن ڕێژەی خەتەنەکردن کەمە، کەواتە بوونی خەتەنەکردن تائێستا هەرهەیە لەناو خێزانو کۆمەڵگەدا لەگەڵ ئەوەشدا کەسیان لەوەڵامدانەوەکەیاندا نەیانووتووە ئێستا زۆرە، هەرچەندە لەنەوەی نوێدا بوونی هەر ماوە کە بەزۆریی ڕێژەی وەڵام نەدانەوەیان بەکەم یان مامناوەند جێگەی سەرنجەو زەنگی خەتەرناکەو پێویستە هەوڵبدرێت بۆ بنەبڕکردنو کاری زیاتربکرێت بۆ نەهێشتنی ئەم دیاردەیە، ئەوەتا لەشارۆچکەدا ڕێژەی زۆر (٢,٧٪)و کەم (٢٩,٧٪)و مامناوەند ڕێژەی (٤٠,٥٪)و هیچ ڕێژەی (٢٧,٣٪) کە ڕێژەی هیچ لەچاو شارولادێدا لەشارۆچکە زیاترە لەگەڵ ئەوەشدا بەڕێژەیەکی مامناوەند لەشارۆچکەدا دەکرێت ئەگەر بەراوردی بکەین بەشارولادێ کە بەڕێژەیەکی کەم بوونی هەیە.

**خشتەی (ب-٨ )ئایا دایکان بەشوێن کەسێکدا دەگەڕێن بۆ ئەوەی کچەکانیان خەتەنە بکەن؟**

| تاچەند بەدوای کەسێکدا دەگەڕێن بۆخەتەنەکردن | ژمارە | ڕێژە |
|---|---|---|
| زۆر | ٣ | ٪٣ |
| مامناوەند | ٧ | ٪٧ |
| کەم | ٦١ | ٪٦١ |
| نازانم | ١٩ | ٪١٩ |
| نیە | ١٠ | ٪١٠ |
| کۆی گشتی | ١٠٠ | ١٠٠٪ |




پرسیاری ئایا دایکان تاچەند بەدوای کەسێکدا دەگەڕێن بۆخەتەنەکردنی کچەکانیان لەم خشتەیەدا ئەوە دەردەخات کە ڕێژەی (٣٪) زۆر دەگەڕێنو ڕێژەی (٧٪) مامناوەند، زۆرترین ڕێژە بریتییە لەوەی کە دایکان کەم دەگەڕێن بەدوای کەسێکدا بۆخەتەنەکردن بەڕێژەی (٦١٪)و لەکاتی پڕکردنەوەی فۆرمەکاندا بەتێبینی ڕای ئەوانەش وەرگیراوە کە ڕێژەی (١٩٪) دەکەنو ئەڵێن نازانین، ڕێژەی (١٠٪)وتویانە نییە، بۆیە لەئێستادا کەمن ئەو دایکانەی کە بەدوای کەسێکدا دەگەڕێن بۆخەتەنەکردنی کچەکانیان کە زۆرترین ڕێژەیە لەخشتەکەدا دەرکەوتووە لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە ڕۆلی زیاتری ڕێکخراوەکانی ژنان بۆ هۆشیارکردنەوەی دایکان گرنگە.

**خشتەی ژمارە ( ب -٩ )**

**ئایا خەتەنەکردن کاریگەریی هەیە بۆ سەر باری تەندروستی؟ بە پێی ئاستی خوێندن**

| کاریگەریی لەسەر تەندروستی | ئاستی خوێندن | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | نەخوێندەوار | ڕێژە | خوێندن و نوسین | ڕێژە | سەرەتایی | ڕێژە | ناوەندی | ڕێژە |
| بەڵێ | ٤٦ | ٥٨,٩٪ | ٨ | ٨٨,٨٪ | ٥ | ٧١,٤٪ | ٥ | ٨٣,٣٪ |
| نەخێر | ٣٠ | ٣٨,٦٪ | ١ | ١١,٢٪ | ٢ | ٢٨,٦٪ | ١ | ١٦,٧٪ |
| | ٧٦ | ١٠٠٪ | ٩ | ١٠٠٪ | ٧ | ١٠٠٪ | ٦ | ١٠٠٪ |




لەم خشتەیەدا بەهەمانشێوەی وەڵامی مامانەکان لەخشتەی کاریگەریی خەتەنە لەسەر سێکسو دەروونداا دەردەکەوێت کە ڕێژەی زۆرییان بە بەڵێ وەڵامیان داوەتەوەو پێیانوایە کاریگەریی دەبێت لەسەر تەندروستیو بەمشێوەیە خوێندن و نووسین وەڵامی بەڵێ ڕێژەی (٨٨,٨٪)، سەرەتای ڕێژەی بەڵێ (٧١,٤٪)، ناوەندی ڕێژەی (٨٣,٣٪) بەبەڵێ وەڵامیان داوەتەوە، ئەوانەشی کە نەخوێندەوارن ڕێژەی (٥٨,٩٪)، ئەگەر تێکڕای ڕێژەی نەخێر وەرگرین (٢٤٪)ی مامانەکان بەنەخێر وەڵامیان داوەتەوە، بۆیە پێویستە مامانەکان هۆشیاربکرێنەوە کە کاریگەریی خەتەنە چییە لەسەر تەندروستی ژنان.

**خشتەی ژمارە ( ب-١٠ )**

**سەبارەت بە پرسیاری ئەوەی کە ئایا دەزانین خەتەنەکردن کاریگەریی هەیە لەسەر سێکس:**

| کاریگەریی | ئاستی خوێندن | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| هەیە بۆسێکس/ | نەخوێندەوار | ڕێژە | خوێندن و نوسین | ڕێژە | سەرەتایی | ڕێژە | ناوەندی | ڕێژە |
| بەڵێ | 44 | 66% | 6 | 86% | 6 | 83% | 5 | 56% |
| نەخێر | 32 | 42% | 1 | 17% | 1 | 14% | 3 | 34% |
| | 76 | %100 | 7 | %100 | 7 | %100 | ٨ | ١٠٠ |




خشتەی ژمارە (ب-١٠) سەبارەت بەپرسیاری ئەوەی کە ئایا دەزانین خەتەنەکردن کاریگەریی هەیە لەسەر سێکس:

ئەو مامانانەی کە خوێندەوارییان لەئاستی خوێندنو نووسینە ژمارەیان (٩) مامانەو ڕێژەی (٦٦٪) پێیانوایە کاریگەریی هەیە، (٣٤٪) پێیانوایە کاریگەریی نییەو ئەو مامانانەی کە خوێندەوارییان لەئاستی سەرەتاییدایە ژمارەیان (٧) مامانەو (٦) لەوان ڕێژەی (٨٦٪) پێیانوایە کاریگەریی هەیە (١) مامانیش ڕێژەی (١٤٪) پێیوایە کاریگەریی نییە.

**خشتەی (ب-١١) ئایا ئەزانی خەتەنەکردن کاریگەریی هەیە لەسەر باری دەروونیی**

| کاریگەریی لەسەر تەندروستی | ئاستی خوێندن | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | نەخوێندەوار | ڕێژە | خوێندن و نوسین | ڕێژە | سەرەتایی | ڕێژە | ناوەندی | ڕێژە |
| بەڵێ | ٤٢ | ٥٥,٧٪ | ٨ | ٨٨,٨٪ | ٥ | ٧١,٤٪ | ٤ | ٦٦,٦٪ |
| نەخێر | ٣٤ | ٤١,٨٪ | ١ | ١١,٢٪ | ٢ | ٢٨,٦٪ | ٢ | ٣٣,٤٪ |
| | ٧٦ | ١٠٠٪ | ٩ | ١٠٠٪ | ٧ | ١٠٠٪ | ٦ | ١٠٠٪ |




خشتەی ژمارە (ب-١١) سەبارەت بەو پرسیارەی کەخەتەنەکردن کاریگەریی هەیە لەسەر دەرونی ئەو منداڵە یان ژنە:

ئەو مامانانەی کە ئاستی خوێندنیان نزمە تەنها خوێندنو نووسینە (٩) کەسنو (٨٨,٨ ٪)یان بەبەڵێ وەڵامیان داوەتەوەو (١٢,٢٪) کەس وتویەتی کاریگەریی نییەو ئەوانەی سەرەتاییان تەواوکردووە (٧)کەسنو (٧١,٤٪)ی مامان بەبەڵێ وەڵامیان داوەتەوەو ئەوانەش کە ئاستی خوێندەوارییان ناوەندیە (٦) کەسن ئەمانیش (٦٦,٦٪)ی بەبەڵێ وەڵامیان داوەتەوە (٣٣,٤٪) ی بەنەخێر وەڵامیان داوەتەوە.

لێرەدا ئەوەی مایەی سەرسوڕمانە لەگەڵ وئەوەی مامانەکە ئاستی خوێندەوارییان نزمەو زانیویانە کە کاریگەریی لەسەر دەرونی ئەو ژنە هەیە لەگەڵ ئەوەشدا کاری خەتەنەکردنیان ئەنجامداوە.

ئەو مامانانەی کە نەخوێندەوارن (٧٨) مامانن لەم ڕێژەیە (٥٥,٧٪) مامان بەبەڵێ وەڵامیان داوەتەوە، (٤١,٨٪) بەنەخێر وەڵامیان داوەتەوە، (٢,٥٪) کەسیش بەنازانم وەڵامیان داوەتەوە مامانەکان نازانن کاریگەریی هەیە لەسەر دەروونی ئەو منداڵە یان ئەو ژنە، بۆیە پێویستە مامانەکان هۆشیاربکرێنەوە.

**خشتەی ژمارە( ب -١٢ ) پرسیاری ئەوبەشەی دەبڕێت چەندبێ ؟**

| ئەوبەشەی دەبڕێت چەندە؟ | ئاستی خوێندن | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | نەخوێندەوار | ڕێژە | خوێندن و نوسین | ڕێژە | سەرەتایی | ڕێژە | ناوەندی | ڕێژە |
| زۆر | 0 | %0 | 0 | %0 | 0 | %0 | 0 | 0% |
| کەم | 40 | %52 | 8 | %22 | 6 | %86 | 3 | 50 ٪ |
| مامناوەند | 10 | %13 | 2 | %56 | 0 | %0 | 1 | 16 ٪ |
| نازانم | 9 | %11 | 1 | %12 | 1 | %14 | 1 | 0% |




لەم خشتەیەدا ئەوەی کە مامانەکان کاری خەتەنەیان ئەنجامداوەو لەوەڵامی ئەو بەشەی کە دەبڕێت چەندبێت باشە بەمشێوەیە ئەوانەی کە نەخوێندەوارن ڕێژەی(٥٢٪) دەڵێن کەم بێت باشە، ئەوانەی خوێندنو نووسین وەڵامی کەم ببڕێت ڕێژەی (٥٦٪)، سەرەتایی ڕێژەی (٨٦٪)، ناوەندی ڕێژەی (٥٠٪) بەکەم ببڕێ وەڵامیان داوەتەوە، ڕێژەی مامناوەندیی لێببڕێت ئەوانەی کە نەخوێندەوارن ڕێژەی(١٣٪)، ئەوەی ئاستی خوێندنی خوێندنو نووسین ڕێژەی (٢٢٪)، سەرەتایی هیچی نەوتووە، ناوەندیی ڕێژەی (١٦٪) بەبەڵێ وەڵامیان داوەتەوە ئەوە دەردەخات کە مامانەکان کاری خەتەنەکردنیان ئەنجامداوەو ئەو کچە لەوتەمەنە منالەدا تووشی ئازارو باری دەروونییو تەندروستی خراپبووە، چونکە هەردوو ڕێژەی کەمو مامناوەند لەلێکردنەوەی بەشێك لەکۆئەندامی زاوزێی ئەو کچە لابراوە، لەهەمانکاتدا خشتەکە ئەوەش دەردەخات کە مامانەکان لەگەڵ کاری خەتەنەدانو پێیان باشە کە بکرێت ئەگەر کەمیش بێت؟

تێبینی وەرگیراوە لەکاتی پرکردنەوەی فۆرمەکاندا کە رێژەی (٢٤٪)وەڵامیان نەداوەتەوە ئەو مامانانەی کەنە خوێندەوارن وە رێژەی(٣٤٪) کە ئاستی خوێندنیان ناوەندییە پێیان باش نیە ببڕێت.

**خشتەی ژمارە ( ب -١٣ )کچەکەی خۆی خەتەنەکردووە ؟**

| کچەکەی کردووە | بەڵێ | نەخێر | ریژەی بەلیٚ | رێژەی نەخێر |
|---|---|---|---|---|
| وەڵام | 64 | 36 | 64% | 36% |
| کۆیگشتی | 100 | | 100% | |




**خشتەی ژمارە (ب -١٣) لەوەڵامی مامانەکاندا بۆ ئەو پرسیارەی کە کچەکەی خۆی خەتەنەکردووە :**

رێژەی ٦٤٪ بەبەلیٚ وەڵامیان داوەتەوە کەواتە لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت کە ژمارەیەکی زۆر لەمامانەکان سەرەڕای ئەوەی کە خۆیان خەتەنەکراونو کاری خەتەنەکردنیان بۆ دەوروبەر ئەنجامداوە ئەم کارەیان دووبارە بەسەر کچەکانی خۆیاندا هێناوە کە ئەمەش بێئاگایی ئەوانە لەزیانەکانی خەتەنە، ئەگەرچی لەخشتەکانی پێشەوەدا ئەوەمان بینی کە زۆرینەی مامانەکان لەزیانەکانی سێکسو دەروونیو تەندروستی خەتەنە بەئاگان،

بەڵام ئەو چارەنووسە ڕەشەیان بۆ کچەکانیان قبوڵەو دەیانەوێت ئەو ئازارەی خۆیان چەشتویانە کچەکانیشیان لێی بەدەرنەبن‌و ڕێژەی **٣٦%**ی مامانەکان کچەکانیان خەتەنە نەکردووە.

**خشتەی ژمارە (ب-١٤-١) ئایا هیچ لایەنێکی بەرپرس ئاگاداری کردویت خەتەنە نەکەیت ؟**

| لەوەڵامی لایەنی بەرپرس ئاگاداری کردویت خەتەنە نەکەیت | ژمارە | ڕێژە |
| --- | --- | --- |
| بەڵێ | 63 | 63.00% |
| نەخێر | 37 | 37.00% |




لەم خشتەیەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە ڕێژەی (٦٣٪) بەبەڵێ وەڵامیانداوەتەوەو ڕێژەی (٣٧٪) بەنەخێر ئاگادارنەکراوین وەڵامیان داوەتەوە، ئەمەش ئەوە دەردەخات کە زۆرینەی مامانەکان ئاگادارکراونەتەوە لەلایەن بەرپرسو ڕێکخراوەکان بۆ ئەوەی کاری خەتەنەکردن نەکەن.

**خشتەی ژمارە (ب-١٤-٢)**

**ناوی ئەولایەنە بڵێ کە ئاگاداری کردویت خەتەنە نەکەیت ؟**

| ناوی ئەو لایەنە | ژمارە | ڕێژەی بەڵێ |
|---|---|---|
| مافی مرۆڤ | 1 | 2.00% |
| NPA | 1 | 2.00% |
| مەلای ئاینی | 3 | 4.00% |
| یەکێتی ژنانی کوردستان | 27 | 42.00% |
| دەزگا تەندروستییەکان | 31 | 50.00% |
| کۆی گشتی | 63 | 100.00% |

ڕێژەی بەڵێ




**خشتەی ژمارە (ب-١٤) لەوەڵامی لایەنی بەرپرس ئاگاداری کردویت خەتەنە نەکەیتو کێیە بەبەڵێ وەڵامی دایەوە:**

٢٪ ئەڵێن مافی مرۆڤ، ٢٪ ڕێکخراوی NPA، ٤٪ مەلای ئایینی، ٤٢٪ ڕێکخراوی یەکێتی ژنانی کوردستان، ٥٠٪ دەزگا تەندروستییەکان ئەمەش ڕێژەی (٦٣٪)ی بەڵێ پێکدێنن‌و لە(٣٧٪) بەنەخێر وەڵامیان داوەتەوە، لێرەدا ئەوەی جێی سەرنجە ئەوەیە دەزگا تەندروستییەکان هەوڵیانداوە بۆئاگادارکردنەوەی مامانەکان کە کاری خەتەنە نەکەن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەم هەوڵەیان کامڵ نییەو پێویستە کاری جددیتری بۆ بکەن‌و وەزاەتی تەندروستی پێویستە هەوڵی بەدەستهێنانی یاسا بداتو ئەم کارە بەتەواوەتی بنەبڕبکاتو مۆڵەتی ڕەسمی ئەو مامانانە وەرگرێتەوە، لەهەمانکاتدا (٣٧٪) مامانەکان هیچ لایەنێك ئاگاداری نەکردوون

که کاری خەتەنە نەکەن، ئەمەش کێشەیەکی گەورەیەو خەمساردیی لایانە بەرپرسەکانی پێوەدیارە، خاڵێکی تر کە لەخشتەکەدا جێی سەرسوڕمانە ئەوەیە کە ڕێکخراوی ژنان تەنها ڕێکخراوە لەنێو ڕێکخراوەکانی کوردستان بەجددیی کاریکردووە بۆ نەمانی ئەم دیاردەیە لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت کارەکان بەرفراوان بکرێت بۆ نەهێشتنی دیاردەکە، چونکە بەپێی خشتەکە تەنها (٤٢٪) مامانەکان لەلایەن ڕێکخراوی یەکێتی ژنانی کوردستانەوە ئاگادارکراونەتەوە.

**خشتەی ( ب -١٥ ) ئەو هۆکارانە چین کە وا لەدایكوباوك دەکەن کە کچەکانیان خەتەنە بکەن**

| هۆکارەکان | کۆ | ڕێژە |
|---|---|---|
| ئاین وسوننەتو حەڵاڵ وحەرام | 68 | ٦٨٪ |
| کەمکردنەوەی جنس | 11 | ١١٪ |
| بێڕەحم و شەرم | 3 | ٣٪ |
| دابونەریتی کۆن | 15 | ١٥٪ |
| نەزانین | 3 | ٣٪ |
| کۆی گشتی | 100 | ١٠٠٪ |




لەم خشتەیەدا ئەو هۆکارانەی کە وای لەدایكوباوك کردووە کچەکانیان خەتەنە بکەن بەرێژەی (٦٨٪) لەبەر سوونەتو ئاین پەیڕەوی خەتەنەکردنیان کرووە ڕێژەی (١١٪) لەبەر کەمکردنەوەی سێکس بۆئەوەی

کچەکانیان تووشی لادانی سێکسی نەبن، ڕێژەی (٣٪) بڕوایان وایە کە کچەکانیان خەتەنەکردووە بۆئەوەی هەستوسۆزیان زۆربێت بۆ دایكوباوكو کەسێکی شەرمن دەبن، ڕێژەی (١٥٪) بەهۆی دابونەریتی کۆن کردوویانە، ڕێژەی (٣٪) نازانن بۆچی کچەکانیان خەتەنەکردووە، کەواتە ئاینوداب‌ونەریتی کۆمەڵایەتی دوو هۆکاری سەرەکیین لەکۆمەڵگەی کوردیدا کە بۆتەهۆی ڕێژەیەکی زۆر لەکچان خەتەنە بکرێنو هۆکاری سێیەمیش کەمکردنەوەی چێژی سێکسە کە بەلابردنی میتکە سنورێك بۆ سێکس لای کچان دانراوە، کەواتە بوونی هەیە ڕێژەی (٣٪) بۆئەوەی کچەکانیان شەرمن بێتو کەسێتی ئەو کچە بەمشێوەیە دروستبکەن، ئەوەی گرنگە ئەوەیە کە دەبێ سەرجەم ڕێکخراوو بەرپرس ڕوونکردنەوەی زیاتر بدەن لەسەر ئەو هۆکارانەی کە لەخشتەکەدا بەدیارخراوە ئەو تێگەیشتنە هەڵانە ڕاستبکرێتەوە بۆئەوەی چیتر دایکانوباوکان کاری خەتەنە ئەنجام نەدەن بۆ کچەکانیان.

**خشتەی ژمارە( ج-١ ) ڕەگەزی نموونەکە دەردەخات**

| ڕەگەز | ژمارە | ڕێژە |
|---|---|---|
| نێر | **15** | 15% |
| مێ | **85** | 85% |
| کۆی گشتی | **100** | 100% |




ئەم خشتەیە ڕەگەزی نموونەی فۆرمی( ج )دەردەخات کە کارمەندانی تەندروستی لەناو بنکەی تەندروستیو نەخۆشخانەکاندا فۆرمیان بەسەردا دابەشکراوە کە ڕێژەی (١٥٪) نێرو ڕێژەی (٨٥٪) مێ کەواتە زۆرترین ڕێژە بریتییە لەڕەگەزی مێ.

**خشتەیژمارە ( ج-٢ )شوێنی نیشتەجێبونی  نموونەکە دەردەخات**

| ڕەگەز | ژمارە | ڕێژە |
|---|---|---|
| شار | ٥١ | 51% |
| شارۆچکە | ٣٧ | 37% |
| لادێ | ١٢ | 12% |
| کۆی گشتی | ١٠٠ | ١٠٠٪ |




شوێنی نیشتەجێبوونی نمونەکە دەردەخات کە ڕێژەی (٥١٪)یان دانیشتووی شار،ڕێژەی (٣٧٪) لە شارۆچکەکانن و ڕێژەی (١٢٪) لەلادێکاندا وەرگیراوە ئەمەش ئەوەدەردەخات کەڕێژەی زۆری نموونەکە دانیشتووی شارن

**خشتەی ژمارە( ج-٣ ) ئاستی خوێندنی گروپەکە دەردەخات**

| ئاستی خوێندن | ژمارە | ڕێژە |
|---|---|---|
| دواناوەندی | 35 | 35% |
| پەیمانگا | 34 | 34% |
| زانکۆ | 20 | 20% |
| هی‌تر | 8 | 8% |
| ئامادەیی نەخۆشەوانی | ٣ | 3% |
| کۆی‌گشتی | 100 | 100% |




خشتەی ژمارە (ج-٣) ئاستی خوێندنی گروپەکە دەردەخات کە ڕێژەی (٣٥٪) دواناوەندییەو ڕێژەی (٣٤٪) پەیمانگا، ڕێژەی (٢٠٪) زانکۆیەو ڕێژەی (٨٪) هیترنو (٣٪) ئامادەیی نەخۆشەوانییە، لێرەدا زۆرترین ڕێژە ئاستی خوێندەواریی دواناوەندییە، لێرەدا ئەوەی جێی سەرنجە کە ڕێژەی زۆری کارمەندانی تەندروستی ئاستی خوێندنیان مامناوەندە کە ئامادەیی‌و پەیمانگایە بەڕێژەی (٢٠٪) دەرچووی زانکۆن.

**خشتەی ( ج-٤ ) کاری خەتەنەی کردووە؟**

| رێژە | ژمارە | خەتەنەی کردووە |
|---|---|---|
| 30% | **30** | بەڵێ |
| 70% | **70** | نەخێر |
| ٪١٠٠ | ١٠٠ | کۆی گشتی |




خشتەی ژمارە (ج-٤) ئەوە ڕووندەکاتەوە کە ئەم گروپە کاری خەتەنەیان ئەنجامداوە ڕێژەی (٣٠٪)و ڕێژەی (٧٠٪)یان ئەم کارەیان نەکردووە. بەڵام دەبێ ئەوەش لەبەر چاو بگرین کە ئەم گروپە لەنێو نەخۆشخانەکاندا کاردەکەنو کارمەندی تەندروستین بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ٪٣٠ ئەم گروپە کاری خەتەنەی ئەنجام داوە کە ئەمەش ڕێژەیەکی زۆرەو پێویستی بەکاری جدی هەیە بۆئەوەی ئەم گروپە کاری بەم شێوەیە ئەنجام ئەدەن.

**خشتەی (ج- ٤-١) ئایا خەتەنەی کردووە بە پێی ڕەگەز**

| خەتەنەی کردووە | ڕەگەز | | | |
|---|---|---|---|---|
| | نێر | ڕێژە | مێ | ڕێژە |
| بەڵێ | ٦ | 40% | ٢٤ | 28% |
| نەخێر | ٩ | 60% | ٦١ | 72% |
| کۆی گشتی | ١٥ | ٪١٠٠ | ٨٥ | ٪١٠٠ |




لەم خشتەیەدا ئەوەمان بۆ دەردەخات کە خەتەنەکردن بەپێێ ڕەگەز ڕێژەی (٤٠٪)ی پیاوان کاری خەتەنەکردنیان کردووەو ڕێژەی (٦٠) پیاوانیش ئەم کارەیان نەکردووەو ڕێژەی (٢٨٪) ژنان خۆیان کاری خەتەنەیان ئەنجامداوە لەگەڵ ئەوەی ڕێژەی نەکردنی خەتەنەکردن لای ژنان ڕێژەی (٧٢٪) لێرەدا دەبێ ئەوە بکرێت کە تەنها ٪١٥ نموونەکە پیاوە لە ٪٨٥ ژنە.

**خشتەی ( ج- ٤-٢ ) ئایا خەتەنەی کردووە بە پێی ئاستی خوێندن**

| خەتەنەیکردووە | ئاستی خوێندن | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | دواناوەندی | ڕێژە | پەیمانگا | ڕێژە | کۆلیج | ڕێژە | هیتر | ڕێژە |
| بەڵێ | ١١ | ٣١٪ | ١٢ | ٣٥٪ | ٣ | ١٥٪ | ٣ | ٣٨٪ |
| نەخێر | ٢٤ | ٦٩٪ | ٢٢ | ٦٥٪ | ١٧ | ٨٥٪ | ٥ | ٦٢٪ |
| | 76 | %100 | 7 | %100 | 7 | %100 | ٨ | ١٠٠٪ |




لەم خشتەیەدا ئەوانەی ئاستی خوێندنیان دواناوەندییە بەڕێژەی (٣١٪) کاری خەتەنەیان کردووەو ئەوانەی پەیمانگایان تەواوکردووە ڕێژەی (٣٥٪) خەتەنەی کردووە، ئەوەی بەتێبینی وەرگیراوە لەکاتی پڕکردنەوەی فۆرمەکاندا ڕێژەی (٣٣٪)ی ئامادەیی نەخۆشەوانی کاری خەتەنەیان کردووە کەمترین ڕێژە ئەوانەن کە ئاستی خوێندنیان بەرزەو زانکۆیان تەواوکردووە بەڕێژەی (١٥٪) خەتەنەیان کردووە لەهەمانکاتدا زۆرترین ڕێژە کە کاری خەتەنەی نەکردبێت ئەوانەن کە ئاستی خوێندنیان بەرزەو زانکۆیان تەواوکردووە کە ڕێژەی (٨٥٪) خەتەنەی نەکردووە، ئاستی خوێندنەکانیتر ڕێژەی نەکردنی خەتەنە نزیکن لەیەکەوە.

**خشتەی ( ج-٥ ) ئەو کەسانەی خەتەنەکراون لەچ تەمەنێکدای بوون؟**

| تەمەنی خەتەنەکردن | ٥ساڵ بەرەوخوار | 10_5 | 15_10 | 15سەروتر | نازانم |
|---|---|---|---|---|---|
| ژمارە | 51 | 26 | 2 | 2 | 19 |
| رێژە | 51% | 26% | 2% | 2% | 19% |




لەخشتەی پێشەوەدا ژمارە(ج-٤)دا بۆمان دەرکەوت کە رێژەی (٣٠٪) کاری خەتەنەیان ئەنجامداوە، کارەکەش بەپێی خشتەی ژمارە (ج-٥) زیاتر بۆ ئەو منالآنەیە کە تەمەنیان لە(٥ ساڵ بەرەوخوار)ە رێژەی (٥١٪)ن، رێژەی (٢٦٪) تەمەنی خەتەنەکردن بریتییە لە(٥-١٠)ساڵو ئەوانەی لەتەمەنی (١٠-١٥) خەتەنەیان بۆکراوە رێژەی(٢٪) پێکدێنن‌و رێژەی (١٩٪) ئەڵێن نازانین کەی‌و لەچ تەمەنێکدا خەتەنەکراوە؟ دیارە نەیانوسیتووە ئەو تەمەنە دیاریبکەن ئەگەرنا ئاستی نموونەکە خوێندنیان باشە چۆن بێئاگان لەتەمەنی خەتەنەکردن.

ئەگەر سەیری ئاستی خوێندنی ئەم گروپە بکەین لەخشتەی ژمارە (ج-٤-٢)دا ئەوانەی خەتەنەیان ئەنجامداوە گروپەکە ئاستی خوێندەوارییی بەرزە کەچی ئەم کارە خراپەیان کردووە بۆ ئەو کچە منالآنەی کەبێئاگان لەتەندروستی خۆیان‌و پاشەڕۆژی خۆیان، کە ئەمەش زوڵم‌و ستەمێکی گەورەیە دەرهەق بەو منالآنە کراوەو یاساو رێکخراوەکان بێدەنگن لەئاستیدا.

**خشتەی (ج-٦) مەبەست لەخەتەنەکردن چیبووە؟**

**بەڕای کارمەندانی تەندروستی**

**نموونەکە**

| ڕێژە | ژمارە | هۆکارەکان |
|---|---|---|
| 36% | 36 | ئاین وسوننەت وحەڵاڵ وحەرام |
| 15% | 15 | دابونەریتی کۆنی کۆمەلاّیەتیوعەشایەری |
| 35% | 35 | کەمکردنەوەیجنس |
| 8% | 8 | نەزانین |
| 6% | 6 | وەلاّمی نەداوەتەوە |
| %100 | 100 | کۆی گشتی |




وەك لەخشتەی ژمارە (ج-٣)دا بۆمان دەرکەوت کە ئاستی خوێندەواریی نموونەکە باشەو سەبادەت بەو پرسیارەی کە هۆکارو مەبەست لەخەتەنەکردن چیبووە لەم خشتەیەدا بەمشێوەیە وەلاّمیان داوەتەوە، ڕێژەی ئاین (٣٦٪) پێکدێنێو ڕێژەی (١٥٪)وتویانە هۆکاری داب‌ونەریتی کۆنو کۆمەلاّیەتیو عەشایەرییەو ڕێژەی (٣٥٪) دەڵێن خەتەنەکردنەکە بەهۆی ئەوەوەبووە تاکو سێکس کەمبکرێتەوە، ڕێژەی (٨٪)وتویانە بەهۆی نەزانینەوەبووە، (٦٪) هیچ وەلاّمێکیان دیارینەکردووە، کەواتە لێرەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت ئەگەر بەراوردی هەمان پرسیار بکەین لەگەڵ فۆرمی (ب)مامانەکاندا ئەوان بەڕێژەیەکی کەمتر وتویانە هۆکارەکەی سێکسە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئاستی ڕۆشنبیریی تاکو زیاتربێت ئەزانن یەکێك لەهۆکارەکان بۆ ئەنجامدانی خەتەنەکردن کەمکردنەوەی سێکس بووە.

**خشتەی ( ج-٧ )ئەو هۆکارانەی دایکان وباوکان کچەکانیان خەتەنەکردووە چیبووە**

| هۆکارەکان | ژمارە | ڕێژە |
|---|---|---|
| ئاین وسوننەت وحەڵاڵ وحەرام | 36 | 36% |
| دابونەریتی کۆنی کۆمەڵایەتی وعەشایەری | ٣٥ | 5%٣ |
| کەمکردنەوەی جنس | ٨ | %٨ |
| نزمی ئاستی ڕۆشنبیری تەندروستی | 15 | 15% |
| نەزانین | ٦ | %٦ |
| کۆی گشتی | 100 | %100 |




لەم خشتەیەدا ئەو هۆکارنەی وای لەدایکان وباوکان کردووە کچەکانیان خەتەنە بکەن بەڕای گروپی نموونەکە پێیانوایە ڕێژەی (٣٦٪) ئاین و سوننەتەو ڕێژەی (٣٥٪) وتویانە بەهۆی داب ونەریتی کۆمەڵایەتی وعەشایەرییەوە، ڕێژەی (٨٪) کەمکردنەوەی سێکس و ئەوانەی پێیانوایە کە دایکان وباوکان بەهۆی نزمیی ئاستی ڕۆشنبیریی و کەمیی ئاستی هۆشیاریی تەندروستییەوە خەتەنەی کچەکانیان کردووە ڕێژەی (١٥٪) پێکدێنن و ڕێژەی (٦٪) وتویانە بەهۆی نەزانینەوە بووە.

لێرەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە هۆکارە سەرکییەکانی خەتەنەکردن بریتین لەهۆکاری ئـاین و کۆمەڵایـەتی و سێکس و لەم گروپەشدا دەرکەوتووە کە هۆکاری سـەرەکی ئـەنجام دەری خەتەنـە لای دیکـان و باوکـان ئـاین و داب ونەریتـە بەدەرەجـەی یەکـەم ئەگەرچـی هـەر ئـەم گروپـە لەخـشتەی (ج-٦)دا پێیـان وایـە مەبەسـت لەخەتەنـەکردن ٪٣٥ پێـی وایـە بـەکاری سێکـسە خەتەنەبکـەن. دەکرێـت ئەمـەش ئـەوە دەربخـات کـە کەمکردنەوەی سێکس لای ژنان خەمی گەورەی کۆمەڵگایە.

**خشتەی( ج-٨ ) تاچەند ئەنجامدەدرێت ئێستا بە پێی شوێنی نیشتەجێبوون**

| تاچەند ئەنجام دەدرێت ئێستا | شوێنی نیشتەجێبوون | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | شار | ڕێژە | شارۆچکە | ڕێژە | لادێ | ڕێژە |
| زۆر | ٠ | ٪٠ | ١ | ٪٣ | ٠ | ٪٠ |
| مامناوەند | ٦ | ٪١٢ | ٩ | ٪٢٤ | ١ | ٪٨ |
| کەم | ٣١ | ٪٦٣ | ١١ | ٪٣٠ | ٩ | ٪٧٥ |
| هیچ | ١٢ | ٪٢٥ | ١٦ | ٪٤٣ | ٢ | ٪١٧ |
| | ٤٩ | ٪١٠٠ | ٣٧ | ٪١٠٠ | ١٢ | ٪١٠٠ |




ئەگەرچی ئەم خشتەیە ئەوەمان بۆ دەردەخات کە ئێستا دیاردەکە زۆر گەورەنییەو خەتەنەکردن کەم ئەنجام دەدرێت بەڵام بوونی دیاردەکە لەمڕۆدا دەردەخات ئەگەرچی قەبارەکەی جیاوازە لای گروپەکانی شارو شارۆچکەو لادێکان.

**خشتەی ژمارە ( ج-٩ ) دایكان تاچەند بەدوای كەسێكدا دەگەڕێن بۆ ئەوەی كچەكانیان خەتەنە بكەن؟**

| دایكان تاچەند دەگەڕێن بەدوای كەسێكدا خەتەنە بكات | زۆر | مامناوەند | كەم | هیچ |
|---|---|---|---|---|
| ژمارە | ٥ | ١٣ | ٧٧ | ٥ |
| ڕێژە | %٥ | %١٣ | %٧٧ | %٥ |




لەم خشتەیەدا ئەوە دەردەخات كە ڕێژەی (٥٪)ی دایكان زۆر دەگەڕێن بەدوای كەسێكدا خەتەنەكەربێتو ڕێژەی (١٣٪) مامناوەندە، زۆرترین ڕێژە ی (٧٧٪)ی دایكان كەم دەگەڕێن بەدوای كەسێكدا بۆئەوەی كچەكانیان خەتەنە بكەنو تێبینی وەرگیراوە لەكاتی پركردنەوەی فۆرمدا كە ڕێژەی (٥٪) وتویانە هیچ دایكێك نییە بگەڕێت بەدوای كەسێكدا بۆ خەتەنەكردن، لێرەدا ئەگەر سەیری خشتەی (ب-٨) بكەین لەفۆرمی مامانەكاندا لەوێشدا زۆرترین ڕێژەی (٦١٪) كەمن ئەو دایكانەی بەشوێن كەسێكدا دەگەڕێن بۆئەوەی كچەكانیان خەتەنەبكەن، ئەمەش ئەوە دەردەخات كە ئێستاش خەڵكانێك هەن بەدوای ئەوەدا دەگەڕێن كچەكانیان خەتەنەبكەن ئەگەرچی بەڕێژەی كەمیش بێت.

**خشتەی ژمارە ( ج-١٠ )**

**ئایا خەتەنەکردن کاریگەریی هەیە لەسەر تەندروستیو سێکسو دەروونی ژنان.**

| ئاستی خوێندن | کاریگەریی لەسەرتەندروستی | | | | کاریگەریی لەسەرسێکس | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | بەڵێ | ڕێژە | نەخێر | ڕێژە | بەڵێ | ڕێژە | نەخێر | ڕێژە |
| پەیمانگا | 32 | 35% | 2 | 20% | 33 | 35% | 1 | 20% |
| دواناوەندی | 31 | 34% | 4 | 40% | 34 | 36% | 1 | 20% |
| زانکۆ | 19 | 21% | 1 | 10% | 19 | 20% | 1 | 20% |
| هیتر | 6 | 8% | 2 | 20% | 6 | 6% | 2 | 40% |
| ئامادەیی نەخۆشەوانی | 2 | 2% | 1 | 10% | 3 | 3% | 0 | 0% |
| کۆی گشتی | 90 | 100% | 10 | 100% | 95 | 100% | 5 | 100% |

**Error!**

| کاریگەریی دەروونی | | | |
|---|---|---|---|
| بەڵێ | ڕێژە | نەخێر | ڕێژە |
| 31 | 35% | 4 | 33% |
| 31 | 35% | 3 | 25% |
| 19 | 22% | 1 | 10% |
| 6 | 7% | 2 | 16% |
| 1 | 1% | 2 | 16% |
| 88 | 100% | 12 | 100% |









لەخشتەی ژمارە(ج-١٠)دا ئەوەمان بۆ روونەدبێتەوە تا ئاستی خوێندن بەرزتربێت هەرچەندە ڕێژەکە جیاوازە لەئاستەکانی خوێندندا بەلاَم کاریگەریی زیانەکانی خەتەنەکردن ئەزانرێت بەوەی کاریگەریی هەیە لەسەر تەندروستیو سێکسو دەروونی ئەو کچانەی کە خەتەنەدەکرێت، ئەوەش لەقۆناغەکانی تەمەنیدا بەدیدەکرێت.

**خشتەی (ج-١١) ئەو پارچەیەی دەبڕێت چەندبێ باشە ؟**

| ئاستی خوێندن | کۆ | ئامادەیی نەخۆشەوانی | ڕێژە | پەیمانگا | ڕێژە | ئامادەیی | ڕێژە | زانکۆ | ڕێژە | هی تر | ڕێژە |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| کەم | 2 | 1 | ٢٪ | ٠ | ٠٪ | 0 | ٠٪ | 1 | ٣٪ | 0 | ٠٪ |
| مام ناوەند | 34 | 16 | ٣٢٪ | ٢ | ٦٦٪ | 5 | ٥٥٪ | ١١ | ٪٣١ | 1 | ١٤٪ |
| نازانم | 35 | 18 | ٣٦٪ | ١ | ٣٤٪ | 3 | ٣٣٪ | ١٣ | ٪٣٦ | 4 | ٥٧٪ |
| نەبێت | 21 | 8 | ١٦٪ | ٠ | ٠٪ | 1 | ١٢٪ | ١١ | ٪٣١ | 2 | ٢٩٪ |
| نەخێر | 8 | 7 | ١٤٪ | ٠ | ٠٪ | 0 | ٠٪ | 0 | ٠٪ | 0 | ٠٪ |
| | 100 | 50 | ١٠٠٪ | ٣ | ٪ ١٠٠ | 9 | ١٠٠٪ | ٣٦ | ١٠٠٪ | 7 | |




-لێرەشدا ئەوەمان بۆدەردەکەوێت کە لەگەڵ ئەوەی ئاستی خوێندەواریی لەم گروپەدا جیاوازەو باشترە لەدوو گروپی پێشووتر، بەڵام زۆرترین ڕێژەی ئەمانیش کە ئەو بەشەی ببڕێت چەندبێت باشە (٥٠) کەسیان پێیانوایە کەمبێت باشەو (٣)کەس دەڵێن مامناوەند، (٢٩)یان دەڵێن هەر نەبڕێت باشترە، (٩)کەس وتویانە نازانینو (٧)کەس دەڵێن نەخێر باش نییە ببڕێت.بۆیە ئەمەش بۆخۆی کێشەیە چونکە بڕینی بەشێکی کەمیش بێت ئەوا بەردەوامی دیاردەکە دەسەلمێنێتو لەهەمان کاتدا هەر توندوتیژو ئازاردانی ژنان کە ئەمەش بۆخۆی دژی مافەکانی ژنە.

**خشتەی (ج-١٢) ئایا کچەکەی خەتەنەکردووە؟**

| کچەکەی خەتەنەکردووە | بەڵێ | نەخێر |
|---|---|---|
| ژمارە | ١٦ | ٨٤ |
| ڕێژە | %١٦ | %٨٤ |




لەم خشتەیەدا ڕێژەی (١٦٪) بەبەڵێ وەڵامیان داوەتەوەو ڕێژەی (٨٤٪) دەڵێن نەخێر کچەکانمان خەتەنە نەکردووە، لێرەدا ئەوەمان بۆدەردەکەوێت وەك لەپێشتر زانیمان ئاستی خوێندنی ئەم گروپە باشن، ئەمەش وایکردووە کە ڕێژەی زۆریان ئەم کارە بۆ کچەکانیان ناکەن.

**خشتەی (ج-١٣-١) ئایا هیچ لایەنێکی بەرپرس ئاگاداری کردویت خەتەنە نەکەیت؟**

| لەلایەن لایەنی بەرپرسەوە ئاگادارکراویت خەتەنە نەکەیت | بەڵێ | نەخێر |
|---|---|---|
| ژمارە | ٣٠ | ٧٠ |
| ڕێژە | %٣٠ | %٧٠ |

لەم خشتەیەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە ڕێژەی (٣٠٪) بەبەڵێ وەڵامیانداوەتەوەو ڕێژەی (٧٠٪) بەنەخێر ئاگادارنەکراوین وەڵامیان داوەتەوە، ئەمەش ئەوە دەردەخات کە ڕێژەی کەمیی کارمەندانی تەندروستی ئاگادارکراونەتەوە لەلایەن بەرپرسو ڕێکخراوەکان بۆ ئەوەی کاری خەتەنەکردن نەکەن.

**خشتەی (ج-١٣-٢) ناوی ئەو لایەنە بڵێ کە ئاگاداری کردویت خەتەنە نەکەیت.**

| ناوی ئەو لایەنە | ژمارە | ڕێژە |
|---|---|---|
| مامۆستایانو زانایانی ئاینی | ٣ | ٪١٠ |
| یەکێتی ژنانی کوردستان | ١٦ | ٪٥٣ |
| دەزگا تەندروستییەکان | ٨ | ٪ ٢٧ |
| ڕاگەیاندن | ٣ | ٪١٠ |
| کۆی گشتی | ٣٠ | ٪100 |




ئەو لایەنە کە ئاگاداری کردونەتەوە کێیە؟ بەمشێوەیە ڕێژەی (١٠٪) لەڕێگەی مامۆستایانو زانایانی ئاینییەوە ڕێژەی (٥٣٪) وتویانە یەکێتی ژنانی کوردستان، ڕێژەی (٢٧٪) لەلایەن دەزگا تەندروستییەکانەوە ئاگادارکراون، ڕێژەی (١٠٪) بەهۆی ڕاگەیاندنەوە بۆیاندەرکەوتووە خەتەنە نەکەن، لێرەدا ئەوەمان بۆدەردەکەوێت کە زۆرترین ڕێژە پێکدەهێنێ کە ئاگاداری کارمەندە تەندروستییەکانی کردووە بۆئەوەی کاری خەتەنە ئەنجام نەدەن تەنها ڕێکخراو ئەویش یەکێتی ژنانی کوردستان-ە، بۆیە لێرەوە پێویستە بوترێت سەرجەم ڕێکخراوەکان بەتایبەت ئەوانەی لەبواری ژناندا کاردەکەن وەکو مافی مرۆڤ، زانایانی ئاینیو دەزگا حکومییەکان هەوڵی جدیتر بدەن بۆ نەهێشتنی دیاردەی خەتەنەکردن لەکچاندا لەنێو هەموو چینوتوێژەکانی کۆمەڵدا.

# گریمانەکان

١-ئاستی خوێندەواریی‌و ڕۆشنبیریی کاریگەریی ڕاستەوخۆی هەیە لەسەر دیاردەی خەتەنە.
٢-ژنان خۆیان بەشێکی گرنگن لەو بڕیاردەرانەی کە کچەکانیان خەتەنە بکرێت.
٣-بوونی جیاوازیی زۆری نێوان شارو شارۆچکەو لادێ لەڕووی کرانەوەیان بەدنیای دەرەوەدا وایکردووە کە شارۆچکەو لادێکان شوێنێکی گونجاو لەباربن بۆمانەوەی دیاردەی خەتەنە.
٤-ئاین‌و دابونەریتی کۆمەڵایەتی‌و سێکس هۆکارە سەرەکییەکانی بڵابونەوەی دیاردەکەیە.
٥-زۆرترین ئەو کچانەی خەتەنەدەکرێن لەتەمەنی زۆر منالێدایە، ئەمەش بۆ ئەوەیە کە بەئاسانی بتوانن کۆنترۆڵی کرداری خەتەنە بکرێن‌و زوتر برینی چاکبێتەوە.
٦-نەبوونی یاسایەك بۆ بنەبڕکردنی دیاردەی خەتەنە هاندەرێکی باشە بۆمانەوەی دیاردەکە.

## تەوەرەی سێیەم/ چەند سەرنجو پێشنیارێك

### چەند سەرنجێك

-ئەنجامدانی ئەم کارە بەگوێرەی یاسایی پاراستنی مافی منداڵ لەو کەسانەی کە تەمەنیان لە ١٨ ساڵ کەمترە بەپێشێلکردنی مافی منداڵ دادەنرێت.

نەتەوە یەکگرتووەکان UN لەساڵی ١٩٧٥-١٩٨٥ بە تەواوی ئەم کارەیان یاساغکردووە.

خەتەنەی منالأنو ژنان کە بەگەورەترین توندوتیژیی دادەنرێت لەولأتی سوید لەدوای ساڵی ١٩٩٠ بەدواوە قەدەغەکراوەو لەدوای جارنامەی جیهانیی مافەکانی منداڵان دێت کە ماوەی ١٦ساڵ دەبێت لەیاسای سویدی بەتاوانێکی گەورە لەقەڵەم دەدرێتو سزاکەشی لەنێوان (٣-١٠) ساڵ زیندانە.

-لەراپۆرتی گشتی ئایاری ساڵی ٢٠٠٦ لەسەر حاڵەتی مافی مرۆڤ لەجیهاندا هاتووە کە تەنها (٩) دەوڵەت (تشريعات)دیاریکراویان هەیە، رووبەرووی شێواندنی ئەندامی زاوزێی مێینە دەبنەوە.

-دروستبوونی چەندەها رێکخراوو گروپی جیاواز بۆ رێگرتن لەم کارە

### پێشنیار

-هۆشیارکردنەوەی کۆمەڵگە لەزیانەکانی دیاردەکە لەرێگەی بەکارهێنانی کەناڵەکانی راگەیاندن بەبینراووبیستراوەوە.

-ئامادەکردنی سیمینارو خولی راهێنانی تایبەتی بۆ مامانەکانو ئەو کەسانەی کە ئەم کارە ئەنجامدەدەن لەسەر یاساغکردنی ئەم کارە.

-گرتنی کۆنفرانس بۆئەم دیاردەیە بۆئەوەی لەم کۆنفرانسەدا لایەنە پەیوەندیدارەکان ئاگاداربکرێنو کاری جددیی بۆ بنەبڕکردنی بکەن.

هۆشیارکردنەوەی خێزانەکان لەکاریگەرییە دەروونییو سێکسییەکان کە لەئەنجامی خەتەنکردنەوە دەکەوێتەوە.

-دروستکردنی کۆمەڵو گروپی جیاواز بۆ رێگەگرتن لەم کارە.

-رێکخراوە مەدەنییو ناحکومییەکان بەتایبەتی رێکخراوەکانی ژنانو ئافرەتان پێویستە رۆڵی بەرچاویان هەبێت لەم بوارەدا.

-دەرکردنی یاسایەك کە ئەنجامدانی ئەم کارە بەشێوەیەك یاساغبکاتو بەتاوان ناوی بەرێت.

-زیادکردنی لێکۆڵینەوەو توێژینەوە لەسەر باری تەندروستی ژنان.

## تەوەرەی چوارەم

## ئەنجامە گشتییەکان

١- توێژینەوەکە ئاماژەی بەوە کردووە کە تاکو تەمەنی ژنان گەورەتربێت ئەوا دیاردەی خەتەنە لەنێو ژناندا گەورەترو زۆرترە، ئەوەتا ئەوانەی لەدایکبووی ساڵی ١٩٩٥و بەرەوخوارن بەرێژەی (٢٪) خەتەنەکراونو رێژەی (١١٪) خەتەنەکراون، بەڵام تاکو بەرەو زۆری تەمەن سەیر بکەین رێژەکە زیادیکردووەو ئەوانەی لەدایکبووی (١٩٥٤) بەرەو خوارەوەن (١٦٪)یان خەتەنەکراونو رێژەی (٤٪)یان خەتەنە نەکراون، کەواتە دابونەریتی کۆن کاریگەریی هەبووە لەسەر پەیڕەوکردنی دیاردەکە.

٢- توێژینەوەکە جەخت لەسەر بوونی دیاردەی خەتەنەکردن دەکاتەوە لەهەموو چینوتوێژەکانی کۆمەڵدا بەئاستە جیاجیاکانی خوێندەواریش، ئەوەتا بەپێی خشتەکە (أ-٥) خەتەنەکردن بەپێی ئاستی خوێندەوار دەردەخات لەگەڵ ئەوەی تاکو ئاستی خوێندەواریی بەرزتربێت رێژەی خەتەنەکردن کەمترەو بەپێچەوانەوە وەك رێژەی (٢,٩٪) بکالوریوس خەتەنەکراوە، بەڵام ئەوانەی نەخوێندەوارن (٢٧,٨٪)یان خەتەنەکراون، کەواتە بەرزکردنەوەی ئاستی رۆشنبیریی‌و خوێندەواریی کاریگەریی هەیە لەسەر تاکەکانی کۆمەڵو هۆکارێکە بۆ کەمکردنەوەی رێژەی خەتەنەکردنو بنەبڕکردنی.

٣-دەرئەنجامەکانی توێژینەوەکە جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە کاریگەریی کەسانێترو دابونەریتی کۆنو باوی کۆمەڵگە لەشاردا کەمترە وەك دەریخستووە کە رێژەی ئەوانەی خەتەنەکراون لەشاردا (٢٨٪)، لەشارۆچکە (٢٩٪)، لەلادێ (٤٣٪) خەتەنەکراون ئەمەش ئەوە دەردەخات کە ژنانی شارەکان پێشکەوتنی باشی بەدەستهێناوە لەگۆڕینی دابونەریتدا بەپێچەوانەی ژنانی لادێ، ئەمەش بەهۆی ئەوەی کە شارنشینەکان کرانەوەیان بەڕووی جیهاندا زیاترە.

٤-توێژینەوەکە دەریخستووە کە بوونی دیاردەی خەتەنەکردن لەئێستادا تاچەند ئەنجامەدەدرێت، ئایا رێژەی (زۆر، زۆر کەم، مامناوەند، هیچ یاخود کەم) لەخشتەی (أ-٦)دا دەرکەوتووە کە زۆرترین رێژە وەڵامدانەوەی کەم، مامناوەندە کەواتە دیاردەکە لەئێستاشدا بوونی هەیە.

بەڵام ئەگەر بەراوردێك بكەین لەنێوان تەمەنی لەدایكبوونی ساڵی(١٩٩٥-بەرەوسەر) لەگەڵ ساڵی(١٩٥٤) بەرەوخوار دەركەوتووە ڕێژەكان زۆر نزیكن لەیەكترو بەمشێوەیە (٢,٠٩٪ ، ٩,٩٪) زۆر، (٢,١٣٪ ، ٧,٤٪) زۆركەم، (٣,٥٪ ، ٨,٠٧٪) مامناوەند، (٦,٥٪ ، ١٠,٢٪) هیچ ، (٨,٣٪ ، ٨,٨٪) كەم، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت ژنانی بەتەمەن كاریگەرییان هەیە لەسەر ئەوەی كۆن نەیانتوانیوە پشت بەخۆیان ببەستنو كەسێتییەكی سەربەخۆ بۆ خۆیان دروستبكەنو ئەوەش دەردەخات كە بەپێی بڕوای نەوەی كۆنونوێ دیاردەی خەتەنەكردن بەڕێژەی كەم بوونی هەیە لەكۆمەڵدا.

٥- توێژینەوەكە ئاماژەی بەوە كردووە كە بەڕێژەی گشتی تەمەنی خەتەنەكردن (٦٢٪)ی ژنان لەتەمەنی زۆر منداڵیدا خەتەنەكراون كە لە(٦ساڵ- بەرەو خوار)، ڕێژەی (٢٠٪)ی ژنان لە(٧-١٢) ساڵی خەتەنەكراون، ڕێژە (٢٪)یان لەتەمەنی (١٨-١٣) ساڵی خەتەنەكراون، لەخشتەی (أ-٧)دا ڕوونكراوەتەوە، ئەمەش ئەوە دەردەخات كە بەهۆی خەتەنەكردنەوە كچ لەمنداڵییەوە تووشی ترسو دڵەڕاوكێو ئازار هاتووەو وایكردووە سەركوتكردنو چەوساندنەوەی ڕووبەڕووببێتەوەو بەهۆیەوە تووشی توندوتیژیی جەستەییو دەروونیی ببێت لەقۆناغەكانی منداڵییو هەرزەكاریداو ڕەنگدانەوەی هەبێت لەقۆناغەكانی تری ژیانیدا.

٦-توێژینەوەكە دەرئەنجامی ئەوەی كە ژنان خۆیان ئەم كردارەیان بەسەرهاتووە تاچەند ئامادەن بەسەر كچەكانیشیاندا بهێنن دەریخستووە لەفۆرمی (ا)دا كە زۆرترین ڕێژەی ئەو ژنانەی كە ئاستی خوێندنیان نەخوێندەوارە بەڕێژەی (٣٣٪) خەتەنەی كچەكانیان دەكەنو خوێندنو نووسین بەڕێژەی (٣٢٪) بڕوای وایە كە كچەكەشی خەتەنە دەكاتو لەفۆرمی مامانەكاندا (ب) ڕێژەی (٦٤٪)ی مامانەكانیش كچەكانیان خەتەنەكردووە، ڕەنگە ئەمە تاڕادەیەك ئاسایی بێت بووترێت ئاستی ڕۆشنبیرییان نزمە، بەڵام ئەوەی جێی سەرنجە ئەوانەی ئاستی خوێندەواریی باشیان هەیە فۆرمی (ج) ئاستی خوێندنیان لەئامادەییەوەیە تاكو بەكالوریوسن ڕێژەی (١٦٪)یان پێیانوایە كچەكەیان خەتەنەبكەن، بۆیە پێویستە هەوڵی جددیی بدرێت بۆ ڕێگە گرتنو بنەبڕكردنی ئەم دیاردەیە ئەگەرنا قەبارەی دیاردەكە لەداهاتوودا زیاد دەبێت.

٧- توێژینەوەكە گەیشتۆتە ئەو دەرئەنجامەی كە زۆرترین ڕێژە كە كاری خەتەنەی كردبێت بریتییە لەمامانەكان كە (٦٥,٩٪) پێكدێنن، (١,٩٪) پزیشكو یاریدەدەری پزیشكن لە(٣٢,٣٪) هیتر، لێرەدا

ئەتوانین ئەوە بەئاشکرا ببینین کە لە(٣٢,٣٪)ی ئەو کەسانەی کە شارەزاییان نییە لەم بوارەداو دەبێتەهۆی زیانی دەروونییو تەندروستی زیاتر بۆ ژنان بەهۆی لێکردنەوەو لابردنی بەشێکی زۆر لە قیتکەو ئەندامی زاوزێی مێینەکە ئەمەش ساردیی سێکسی لێدەکەوێتەوەو دەبێتەهۆی هەڵوەشاندنەوەی خێزان یاخود دەبێتە بیانویەك لای پیاوان بۆ هێنانی ژنی دووەم.

ئەو مامانە کە مۆڵەتی ڕەسمییان هەیە تەنها ئاگادارکردنەوەیان لەلایەن دامودەزگاکانی تەندروستیو ڕێکخراوەکان بەس نییە بۆ خەتەنە نەکردن بەڵکو پێویستە لێپرسینەوەو سزایان هەبێت.

٨- توێژینەوەکە دەریخستووە ئەو ژنانەی شویان کردووە ژمارەیان (٧٣٦)و (٤٧٦)ژننو ڕێژەی ئەوانەی کە خەتەنەکراونو تا چەند کاریگەریی هەبووە بۆ جنس لەخشتەی (أ-١٠)دا بریتییە لە(٥٧,٣٪) هەستیان بەوە کردووە کە لەکرداری سێکس ساردن، کەواتە دەریدەخات پەیوەندیی سستی لەنێوان ژنومێردەکاندا ئاسایی نییەو ڕێژەی (٤٢,٧٪) پێیانوایە ئەوەی کاریگەریی نییە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆئەوەی کە ڕۆشنبیریی سێکسی لاوازەو پێویستە ڕۆشنبیریی تەندروستی تەواو ئاراستەی هەموو ژن ومێردەکان بکرێت لەڕێگەی پەروەردەی سێکسیو خێزانییەوە.

٩- دەرئەنجامەکانی توێژینەوەکە دەریدەخات ئەو ژنانەی کە شوویانکردووە (٧٣٦) ژنە و ٢٥٣ ژن کە ڕێژەی (٣٤,٤٪)و لایان وایە کاریگەریی هەیە لەسەر باری دەروونییو (٤٨٣) ژن کە ڕێژەی (٦٥,٦٪)پێیانوایە کە بڕینی میتکە هیچ کاریگەرییەکی دەروونیی نییە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆئەوەی کە ژنان زانیارییان زۆر کەمە، لەوبارەیەوە وەك ئاشکرایە زانست ئەوەی سەلماندووە کە بڕینی میتکە زۆر ڕۆڵی هەیە لەکرداری سێکسدا، دواتر ژن بەهۆی ئەم کردارەوە تووشی خەمۆکییو دڵەڕاوکێو ترس دەبێت، ئەمانەش هەمووی کاریگەریی خراپی هەیە لەڕووی دەروونییەوە بۆ سەر کەسێتی ژن.

١٠- نموونەی توێژینەوەکە ئەوە دەردەکەوێت کە زۆرترین ڕێژەی مامانەکان لە (٧٨٪) نەخوێندەوارنو ژیانی زۆرێك لەئافرەتانی کوردیان بەدەستە، ئێستەش کەم نین ئەوانەی لەگوندو شارۆچکەداو تەنانەت لەشارەکاندا پشت بەمامانەکان دەبەستن لەکاتی دووگیانییو دواتر هەر ئەمانە کاری خەتەنە ئەنجامدەدەن، ڕێژەیەکی زۆر لەمانە مۆڵەتی ڕەسمی وەزارەتی تەندروستی وەردەگرن بەبێ ئەوەی ڕەچاوی ئاستی خوێندن بکرێت، بەپێی

خشتەی ژمارە(٢) فۆرمی مامانەکان دەردەکەوێت کە لەکۆی (١٠٠) مامان ڕێژەی (٨٨٪)یان مۆڵەتی ڕەسمی هەیە.

١١- توێژینەوەکە ئەوەش دەردەخات کە ئەو مامانانەی کە شوێنی نیشتەجێبوونیان شارە لە(٤٣) مامان ئەوانەی خەتەنەیان کردووە بریتین لە (٢٤) مامان لەشوێنە جیاجیاکاندا کاری خەتەنەیان کردووە کە تەنها ڕێژەی (٧١٪)لەم مامانانە لەناوشاردا ئەم کارەیان ئەنجامداوە لەگەڵ ئەوەی کە ڕێژەی (٤٣٪)لەشارۆچکەو لە (٣٠٪) لەلادێکاندا خەتەنەی ئەنجامداوە، بەڵام ئەوانەی دانیشتوی لادێن کە (١١) لەمامانەکان خەتەنەیان کردووەو (٢٧٪)ی ئەم مامانانە لەلادێکاندا کاری خەتەنەیان کردووەو هیچ کام لەم مامانانە لەلادێوە نەهاتوونەتە شار بۆکاری خەتەنەو ڕێژەی (٪سفرە)، ئەمەش ئەوە دەردەخات کە لادێکان شوێنی لەبارن بۆ مانەوەی دیاردەکە.

١٢-توێژینەوەکە ئەوەشی دەرخستووە کە ئەو هۆکارانەی ڕۆڵی سەرەکیی دەبینن لەئەنجامدانی خەتەنەکردنی کچاندا وایکردووە کە دایکانوباوکان کچەکانیان خەتەنەبکەن بریتین لەهۆکارەکانی ئاین بەڕێژەی (٦٨٪) لەفۆرمی (ب) بەپێی وەڵامی مامانەکانو بەپێی فۆرمی (ج) ڕێژەی (٣٦٪)ئەڵێن هۆکاری ئاینە بەپێی ڕای کارمەندانی تەندروستیو دوای ئەو هۆکارە هۆکاری کۆمەڵایەتییە کە ڕێژەی (١٥٪) پێکدێنێ بەپێی ڕای مامانەکانو ڕێژەی (٣٥٪) پێیانوایە بەڕای کارمەندانی تەندروستی هۆکاری کۆمەڵایەتیو هۆکاری سێکس سێیەم هۆکارە بەڕێژەی (١١٪) لای مامانەکان دایکانوباوکان لەبەر کەمکردنەوەی سێکسە کچەکانیان خەتەنەدەکەنو کارمەندانی تەندروستی ڕێژەی (٨٪) پێکدێنێت هۆکاری سێکس لەگەڵ ئەوەی کە بەڕای کارمەندانی تەندروستی خۆیان هۆکاری سێکس ڕێژەی (٣٥٪) پێکدێنێت، بۆیە گرنگە ئەم هۆکارانە بەجددیی کاری لەسەر بکرێت بۆئەوەی دیاردەکە بەتەواوەتی یان زۆر کەمبێتەوە لەکۆمەڵگاکەماندا.

١٣- ئەنجامێکی تر کە لەتوێژینەوەکەدا دەرکەوتووە کە بەپێی فۆرمی لەخشتەی (ب-٧)،( ج-٨) هەردوو فۆرمەکەدا ئەگەر بەراوردێك بکەین کە تاچەند خەتەنەکردن ئەنجامدەدرێت لەئێستادا دەردەکەوێت لەگەڵ ئەوەی ئاستی خوێندەواریی ئەم دوو گروپە جیاوازە، بەڵام ڕێژەی وەڵامدانەوەیان بۆ پرسیارەکە نزیکن لەیەکترو ئەگەر بەپێی شوێنی نیشتەجێبوونیش سەیربکەین کە بوونی دیاردەکەیان دیاریکردووە دەتوانین بڵێین لەکۆی

(٥١) کەس کە دانیشتوی شارن لەهەردوو گروپەکەدا (٣٧)مامانو(٣١)کارمەندی تەندروستی دەڵێن دیاردەکە کەمەو (٦)مامانو(١٢)کارمەندی تەندروستی دەڵێن هیچ نییە لەئێستادا، لێرەوە ئەوەمان بۆدەردەکەوێت کە دیاردەکە بوونی هەیە لەئێستادا هەرچەندە ژمارەی کارمەندانی تەندروستی زیاترە کە دەڵێن ئێستا هیچ نەماوە لەچاو مامانەکاندا ئەوە دەردەخات کە لەلای چینی ئاستی خوێندەواری بەرزدا کەمتر دیاردەکە بەدیدەکرێت کە جێی سەرنجەو ئەبێت ئەمان زیاتر ئاگاداری بوونی دیاردەکەبن، لەگەڵ ئەوەشدا ڕەنگە مامانەکان لەبەرئەوەی کاری خەتەنەکردنیان زیاتر ئەنجامداوە باشتر ئاگاداری ئەوەن کە دیاردەی خەتەنە تاچەند بوونی ماوە لەئێستادا.

١٤- توێژینەوەکە دەریخستووە کە بەپێی وەڵامی مامانەکانو کارمەندانی تەندروستیەکە ئایا تاچەند دایکان بەدوای کەسێکدا دەگەڕێن کە خەتەنە بکەن بۆ کچەکانیان بەرێژەی (٦١٪، ٧٧٪) کەمە بەبەراورد بە(زۆر، مامناوەند، هیچ)، لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کە دابونەریتو بیروڕای دایکان بەهۆکاری ئەنجامدانی خەتەنە لەنێو خێزانەکاندا لەبیروبۆچوونیاندا چەسپیووەو تائێستاش بەشوێن کەسێکدا دەگەڕێن بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە.

## <u>دەرئە نجامەکانی لێکۆڵینەوەکە :-</u>

سەرەتای لێکۆڵینەوەکە ئەو گریمانانەی کە کرابوون بۆ دیاردەکە ئەنجامەکانی بەمشێوەیە کەوتەوە هەروەك لەلێکۆڵینەوەکەدا خراوەتەڕوو.

١- ئاستی خوێندەواریی‌و ڕۆشنبیریی کاریگەریی زۆر هەیە لەسەر دیاردەی خەتەنەکردنی کچان، ئەوەتانێ زۆرترین مامان کە کاری خەتەنەی کچەکانیان ئەنجامداوە ئاستی خوێندەوارییان نییە، واتە نەخوێندەوارنو ڕێژەی (٧٨٪) پێکدێننو ئەو ژنانەی کە ئاستی خوێندەوارییان نزمە (٦٣٪) ڕێژەکە پێکدێننو لەخشتەی (أ-٤) دەرکەوتووە تاکو ئاستی خوێندن نزمتربێت ڕێژەی خەتەنەکردن زۆرترە کە ئەو ژنانەن خەتەنەکراونو تاکو ئاستی خوێندن نزمتربێت ڕێژەی خەتەنەکردنی کچەکانیان واتە ئەو کارەی بەسەرخۆیاندا هاتووە بەسەر کچەکانیشیاندا دەهێننەوە زیاتردەبێ، کەواتە پێشبینیمان بۆ ئەم گریمانەیە ڕاستەو ئاستی خوێندن کاریگەریی هەیە لەسەر خەتەنەکردنی کچان.

٢- گریمانەیکی تر ئەوەبوو کە ژنان خۆیان بەشێکی گرنگن لەوبڕیار دەرانەی کە کچەکانیان خەتەنە بکرێت ئەمەش لەئەنجامی توێژینەوەکە ڕاست دەرچوو ئەوەتانێ مامانەکان بەڕێژەی (٦٤٪) کچەکانی خۆیان خەتەنەکردووە کاریگەریان هەبووە لەسەر کچەکانیان و وەئێستاش ڕێژەیەك لە دایکان دەگەڕێن بەشوێن کەسێکدا کاری خەتەنە بکات بۆئەوەی کچەکانیان خەتەنە بکەن

٣- یەکێکی تر لەو گریمانانەی کە کرابوو ئەوەیە کە هۆکاری ئاینوکۆمەلایەتیوسێکس بریتین لەهۆکارە سەرەکیەکانی خەتەنەکردنی کچان و گرنگن بۆ بلاوبوونەوەی ئەم دیاردەیە لەنێو کۆمەلگای کوردیدا کەئەمەش لە لێکۆلینەوەکەدا دەرکەوت کە ئاینو حەلالوحەرام ڕێژەی (٦٨٪) کاریگەرە بۆکردنی خەتەنە وە ڕیچژەی (١٥٪) دابونەریتی کۆنی کۆمەلایەتییە ، (١١٪) کەمکردنەوەی سێکسە،بەپێی ڕای مامانەکان وە بەراوبۆچوونی کارمەندانی تەندروستی ڕێژەی(٣٦٪)ئاین،ڕێژەی(٪ ١٥) دابونەریتی کۆمەلایەتی، ڕێژەی (٣٥٪) لەبەرکەمکردنەوەی ئارەزووی سێکس ئەنجامدەدرێت.

٤- گریمانەیکی ترمان ئەوەبوو کە شارۆچکەوگوندەکان شوێنێکی لەبارترن لەچاو شارەکاندا بۆبلاوبوونەوەو بەردەوامی دیاردەکە بەلام دەرکەوت کە جیاوازی لەنێوان شاروشارۆچکەکاندا کەمەو زۆرهەستی پێناکرێت لەچاو لادێکاندا واتە شاروشارۆچکەکان لەچاو گوندەکاندا ئەو شوێنە گونجاوە نین کە دیاردەکەی تێدا بەردەوام بێت سەیری خشتەی (أ-٤-II) بکە لەوانەیە ئەمەش بگەڕێتەوە بۆئەو پێشکەوتنە بەرچاوەی کە لەشارۆچکەکانی کوردستاندا بەدی دەکرێت لەڕووی ئاوەدان بوونەوەو دابین کردنی خومەتگوزاریو پێشکەوتنی بواری ڕۆشنبیری لەشارۆچکەکاندا.

٥- سەبارەت بەگریمانەی ئەوەی کە زۆرترین ئەو کچانەی کە خەتەنەیان بۆکراوە لەتەمەنی زۆرمنالیدا بووە، ئەوا لەتوێژینەوەکەدا ئەمە زۆر ئاشکرایە کە ڕاستەو زۆرترین ئەو کچانەی خەتەنەیان بۆکراوە تەمەنیان لە ٦ سالێ وبەرەوخوارە هەروەك تێبینی کرا لەکاتی پڕکردنەوەی فۆرمەکاندا لەبەر ئاسانی خەتەنەکردنەکەیە لەم تەمەنەدا وە برینەکەشیان زوو چاکدەبێتەوە.

٦-دوایین گریمانە سەبارەت بەوەیە کە نەبوونی یاسایەك بۆ دیاردەکە هاندەری باشە بۆمانەوەی خەتەنەی کچان، ئەم گریمانەش تا ڕادەیەکی زۆر ڕاستە چونکە ئەگەر سەیری خشتەکانی (ب-١٤-١) فۆرمی مامانەکان بکەین

لەگـــەڵ خـــشتەی (ج-١٣-١) ئـــەوا دەردەکـــەوێت کـــە هەوڵـــەکان کـــەمن بۆئـــەوەی مامـــانو کارمەنـــدان ئاگاداربکرێتەوە لەنەکردنی خەتەنەی کچان بەتایبەتی لە خشتەی (ج١٣) دەرکەوتووە کە لە ٪٧٠ کارمەنـدان هیچ لایەنێك ئاگاداری نەکردوون لەنەکردنی خەتەنەی کچان.

## -وێنەی فۆرمی ڕا پرسیەکان

**( أ ) فۆرمی ئاماری ئاستی ڕۆشنبیری لەسەر خەتەنەکردن لەنێوژناندا**

١-ساڵی لەدایك بوون ------------

٢- شوێنی لەدایك بوون: شار--------- شارۆچکە---------- لادێ-------

٣- شوێنی نیشتەجێ بوونی ئێستا: شار------- شارۆچکە----------- لادێ------------

٤- ئاستی خوێندن: نەخوێندەوار--------- خوێندنو نوسین----------- سەرەتایی---------

---------- ناوەندی------- دواناوەندی---------- کۆلیج------------

٥- کاردەکەیت؟ بەڵێ ------------ نەخێر----------

٦- جۆری کار---------

٧- خەتەنەکراوە؟ بەڵێ ------------ نەخێر------------

٨- شوێنی خەتەنەکردن---------

٩- کێ ئەم کارەی ئەنجام دا؟ پزیشك --------- مامان----------- ژنی لاکۆڵان----------

١٠- لەچ تەمەنێکدا خەتەنەکراوە: ٦ساڵو بەرەو خوار----------- ٧ -١٢ ساڵ --------- ١٣ —

١٨ ساڵ------------------ ١٩ -٢٣ ساڵ------------------ ٢٤ ساڵو زیاتر-------

١١- شوی کردووە؟ بەڵێ-------------- نەخێر--------------

١٢ ئەگەر شووی کردووە پەیوەندی جنسی کاریگەری هەبووە؟ بەڵێ------------ نەخێر--------

١٣- ئایا ئێستا هەست بەناخۆشی دەکەیت بەتایبەتی باری دەروونی؟بەڵێ-------نەخێر----------

١٤- ئەگەر کچت هەیە.... خەتەنەی ئەکەی؟ بەڵێ------------نەخێر-----------

١٥- ئایا ئەزانی خەتەنەکردنی زیانی تەندروستی هەیە؟ بەڵێ----------نەخێر-------

١٦- بەڕای تۆ ئەم دیاردەیە تاچەند ئەنجام دەدرێت؟

زۆر------ مام ناوەند------کەم----------زۆرکەم------ هیچ ---نازانم-------

**یەکێتی ژنانی کوردستان**

**مەکتەبی سکرتاریەت**

**بەشی تەندروستی**

**( ب )فۆرمی زانیاری لەسەرخەتەنەکردن لەنێومامان دا**

١. ساڵی لەدایك بوون:-...............

٢. شوێنی نیشتەجێ بوونی ئێستا: شار ........ شارۆچکە....... لادێ..........

٣. ئاستی خوێندن

نەخوێندەوار ........ خوێندن ونوسین....... سەرەتایی....... ناوەندی ........

٤. مۆڵەتی ڕەسمی مامانی وەرگرتووە؟ بەڵێ ....... نەخێر........

.........ئەگەر(بەڵێ)یە چەند ساڵە مامانیت؟ .........5

٦. کاری خەتەنەکردنت ئەنجامداوە بەڵێ ....... نەخێر........

٧.ئەو شوێنەی کاری خەتەنەکردنت تیادا ئەنجام داوە شار....... شارۆچکە.......... لادێ........

٨. ئەو کەسانەی کاری خەتەنەکردنەکەت بۆکردوون زۆرترینیان لە چ تەمەنێکدا بوون؟

٥ساڵ وبەرەوخوار.....٥-١٠ساڵ......١٠-١٥ساڵ...... ١٥ساڵ و زیاتر..........

٩. بەزۆری لە چ وەرزێکدا خەتەنە دەکرێت ؟.....................

١٠. بەڕای تۆ ئەم وەرزە بۆباشە بۆخەتەنکردن.....................

١١. مەبەست لەخەتەنەکردن چی بووە؟...............

١٢. ئەم دیاردەیە ئێستا تا چەند ئەنجام دەدرێت ؟

زۆر .... مام ناوەند.... کەم...... هیچ....

١٣.ئایا دایکان تاچەندە بەشوێن کەسێکدا دەگەڕێن کە خەتەنەبکەن بۆکچەکانیان؟

زۆر .... مام ناوەند.... کەم......

١٤. ئایا دەزانیت خەتەنەکردن کاریگەری هەیە لەسەر تەندروستی ؟ بەڵێ ....... نەخێر........

١٥. ئایا دەزانیت خەتەنەکردن کاریگەری هەیە لەسەر کرداری جنسی؟ بەڵێ ....... نەخێر........

١٦. ئایا دەزانیت خەتەنەکردن کاریگەری هەیە لەسەرباری‌دەروونی؟ بەڵێ ....... نەخێر........

١٧. ئەوبەشەی کە دەبڕێت پێت باشە زۆربێت....... کەم........ مامناوەند........

١٨. ئایا کچەکەی خۆت خەتەنەکردووە؟ بەڵێ............ نەخێر...........

١٩. ئایا هیچ لایەنێکی بەرپرس تۆی ئاگادار کردۆتەوە کاری خەتەنەنەکەیت ؟ بەڵێ..... نەخێر..........

٢٠. ئەگەر( بەڵێ) یە ئەولایەنەکێ یە ؟....................................

بەڕای تۆ ئەو هۆکارانە چین کەوا لەدایك و باوك دەکەن کە کچەکانیان خەتەنەبکەن ؟.21

**یەکێتی ژنانی کوردستان**

**بەشی تەندروستی**

## ( ج ) فۆرمی زانیاری لەسەرخەتەنەکردن لەنێوکارمەندانی تەندروستیدا

١- سالّی لەدایك بوون:-................

٢- ڕەگەز : - نێر....... مێ..............

٣- شوێنی نیشتەجێبوونی ئێستا: شار ........ شارۆچکە....... لادێ..........

٤- ئاستی خوێندن: دواناوەندی........ پەیمانگا........زانکۆ........ هی تر..........

٥- کاری خەتەنەکردنت کردووە ؟ بەلّێ ....... نەخێر........

٦- ئەو کەسانەی خەتەنەکراون لە چ تەمەنێکدا بوون؟ ٥سالّ وبەرەوخوار.....٥-١٠سالّ......١٠-١٥سالّ...... ١٥سالّ و زیاتر.........

٧- مەبەست لەخەتەنەکردن چی بووە؟............

٨- ئەم دیاردەیە ئێستا تا چەند ئەنجام دەدرێت ؟

٩- زۆر .... مام ناوەند.... کەم...... هیچ....

١٠- ئایا دایکان تاچەندە بەشوێن کەسێکدا دەگەڕێن کە خەتەنەبکەن بۆکچەکانیان؟ زۆر .... مام ناوەند.... کەم...

١١- ئایا خەتەنەکردن کاریگەری هەیە لەسەر تەندروستی ؟ بەلّێ ....... نەخێر........

١٢- ئایا خەتەنەکردن کاریگەری هەیە لەسەر کرداری جنسی ؟ بەلّێ ....... نەخێر........

١٣- ئایا خەتەنەکردن کاریگەری هەیە لەسەرباریدەروونی؟ بەلّێ ....... نەخێر........

١٤- ئەوبەشەی کە دەبڕێت پێت باشە زۆربێت.... کەم............ مامناوەند............

١٥- ئایا کچەکەی خۆت خەتەنەکردووە؟ بەلّێ..... نەخێر..........

١٦- ئایا هیچ لایەنێکی بەرپرس تۆی ئاگادار کردۆتەوە کاری خەتەنەنەکەیت ؟ بەلّێ.. نەخێر......

١٧- ئەگەر( بەلّێ) یە ئەولایەنەکێ یە ؟......

١٨- بەڕای تۆ ئەو هۆکارانە چین کەوا لەدایك و باوك دەکەن کە کچەکانیان خەتەنەبکەن ؟

***یەکێتی ژنانی کوردستان***

***بەشی تەندروستی***

# بەڵگەنامەکان



WOMAN – STRUGGLE – LIFE
(ZHINAN – WOMEN UNION OF KURDISTAN
SECRETARIAL BUREAU
Department of Health
No.:
Date : / / 2002

ژن . خەبات . ژیان
یەکێتی ژنانی کوردستان
مەکتەبی سکرتاریەت
بەشی تەندروستی
ژمارە : ١٨٣
رۆژ : ٤/٥/ ٢٠٠٢

بۆ/فەرمانگەی تەندروستی سلێمانی/بەڕێوەبەرایەتی نەخۆشخانەی منداڵبوون
بابەت/پێدانی زانیاری

سڵاوێکی گەرم.....

لەپێناو بەرزکردنەوەی ئاستی ڕۆشنبیری کۆمەڵ بەگشتی وژنان بەتایبەتی پێویستمان بەهاوکاری بەڕێزتان هەیە کەنوسراوێکمان ئاڕاستەبکەن سەبارەت بەڕاوبۆچوونتان لەسەر ڕادەی کاریگەرێتی خەتەنەکردنی کچان وژنان لەڕووی تەندروستی و دەروونی یەوە.

هاوکاریتان جێی ڕێزو سوپاسە.....

مەکتەبی سکرتاریەت
بەشی تەندروستی

وێنەیەک بۆ/
*نوسینگەی تایبەت/بۆئاگاداریتان
*بەشی تەندروستی/بەدواداچون
*ئەرشیف

ah- Salim Str.
663- 2130485

سلێمانی- شەقامی سالم
تەلەفون : ٢١٢٢٦٦٣- ٢١٣٠٤٨٥



بەڕێوەبەرایەتی نەخۆشخانەی
منداڵبوون - فێرکاری

زیانەکانی خەتەنەکردنی کچان

أ / زیانە کتوپریەکان :
ب / زیانەکانی لە داهاتوودا دەردەکەوێ :

أ – زیانە کتوپریەکان :

١ – توش بوونی نەزیف // لە کاتی خەتەنەکردنەکەدا لەوانەیە نزیف دروست ببێ وە ژیانی کچەکە دەخاتە خەتەرەوە . هەندێ جار گەر زوو نەگەیەنرێتە نەخۆشخانە دەمرێت . یان پێویستی بە خوێن وەرگرتن دەبێ وە لە ژێر بەنجدا لەوانەیە پێویستی بە دورینەوە هەبێ .
٢ – تووش بوون بە التهابات لە شوێنە بڕاوەکەو ئاوساندن لەوانەیە التهاباتەکە بگوێزرێتەوە بۆ هەندێ شوێنی تر لەلەشیدا لەوانەیە بچێ بۆ کۆئەندامی زاوزێ و لەوانەیە ببێتە هۆی نەزۆکی .
٣ – تووش بوونی ئازارێکی زۆرو ترس و دڵە ڕاوکێ .

ب – زیانەکان لە داهاتوودا دەرئەکەوێ :

١ – تووش بوونی تشوە لە شوێنی خەتەنەکە کە هەندێ جار زۆری لێ دەبڕێ .
٢ – هەندێ جار سارنی سێکسی ( برود جنسی ) دروست دەکات لەبەر تێکچونی باری دەرونی نەخوشەکە توسی دڵە ڕاوکێ دەبێت دەترسێ لە سێکس ، هەندێ جار برودی جنسی دروست دەبێ لەبەر بوونی ئازارێکی زۆر لەو ناوچەیەدا کە لە ئەنجامی ئەوەی بەشێکی زۆری لێ بڕاوە ، هەندێ جاری تر برودی جنسی دروست دەبێت لە ئەنجامی ئەوەی هەندێ شوێنی حساس هەیە دەبڕێت .
٣ – هەندێ جار کچەکە تووشی باری دەرونی یەکی ناهەموار دەبێت و لەوانەیە کارێکی زۆر بکاتە سەر باری دەرونی هەندێکیان رفضی ئەوە ئەکەن کە شووبکەن ، هەندێکی تریان شوو دەکەن بەڵام باری دەرونیان تەواو نابێ بە هۆی برودی جنسیەوە هەندێ جار لەوانەیە ببێت بە هۆی تێک چوونی خێزان .

دکتورە
ژیان أحمد عبدالله
بەڕێوەبەری نەخۆشخانەی منداڵبوون
٢٠٠٢/٥/٥

WOMAN – STRUGGLE – LIFE
(ZHINAN – WOMEN'S UNION OF KURDISTAN
SECRETARIAL BUREAU
No.:
Date: / /2002

ژن . خەبات . ژیان
یەکێتی ژنانی کوردستان
مەکتەبی سکرتاریەت
ژمارە : ١٩٣
رۆژ : ٧ / ٥ /٢٠٠٢

یونسێف ی هەولێر / بەشی راگەیاندن
( لیژنەی پێداچوونەوەی نامیلکەی راستیەکان بۆ ژنان )

یەکێتی ژنانی کوردستان بەبەرنامەی تایبەت هەوڵی ووشیارکردنەوەی ژنانی داوە بۆ تێگەیشتن لە زیانەکانی خەتەنەو بن برکردنی کەلەهەندێ شوێن دا ئەو کردارە بەدی دەکرا . بۆیە نوێنەرمان بەباشی زانی کەئەو بابەتە بخاتەروو لەو کۆنفرانسەدا کەلەهەولێر گیرا بۆ مەبەستی پێداچوونەوەی نامیلکەی راستیەکان بۆ ژیان پێشنیارەکە پەسەندیش کرا .
لەگەڵ ئەم نوسراوەدا ( زیانەکانی خەتەنەکردنی کچان ) تان بۆ ئەنێرین کەلەلایەن دکتۆرە ژیان احمد عبدالله وە نوسراوە . هیوادارین لەنامیلکەکەدا جێگای خۆی بکاتەوە .

لەگەڵ رێزدا

**هاوپێچ**
نوسراوێك لەسەر زیانەکانی خەتەنەی کچان .

بەشی تەندروستی
مەکتەبی سکرتاریەت
یەکێتی ژنانی کوردستان

**وێنەیەك بۆ :**
- وەزارەتی تەندروستی / بۆ ئاگاداریتان .
- یونسێفی سلێمانی بەشی راگەیاندن / بۆ ئاگاداریتان .
- نوسینگەی تایبەت / بۆ ئاگاداریتان .
- بەشی تەندروستی .
- ئەرشیف .

...ah- Salim Str.
...63- 2130485
سلیمانی- شەقامی سالم
تەلەفون : ٢١٢٢٦٦٢ - ٢١٣٠٤٨٥

بسم الله الرحمن الرحيم
فاسألوا اهل الذكر ان كنتم لا تعلمون

یەکیەتی زانایانی ئیسلامی کوردستان
لیژنەی بالای فتوا

ژمارە : ١٥
بەروار :- ٢٨/صفر/١٤٢٧
٢٨/٣/٢٠٠٦

بۆ/ ئەوەی مەبەستیەتی
بابەت/ حوکمی شەرع لە سوننەت کردن

ڕای جەماوەری زانایان لەسەر ئەوەیە کە خەتەنەکردنی ئافرەتان سوننەتە ، وە زانایانیش پێناسەی سوننەتیان بەم شێوەی کردووە فەرمویانە ، سوننەت بیکەیت خێرت دەگات نەیکەیت گوناهبار نابیت .
ئێمەش وەك لیژنەی بالای فتوا بۆ ئێمەو ڕای جەماوەری زانایانمان زیاتر بەلاوە پەسەندە و هەروەها ڕایەکیشی هەیە لە مەزهەبی ئیمامی شافعی دا .
وەلێکو بیوك هەیە نەیکات وە لە نەکردنیا هیچ گوناهی ناگات ، ئەوەش کە باوەو ئەڵێن ، ئافرەتی خەتەنە نەکراو نوێژی دروست نیە و گۆشتی دەستی حەرامە ، ئەوە هیچ بنەمایەکی ڕاستی نیە لە قورئان و سوننە و فیقهی ئیسلامیدا .

لەگەڵ ڕێز

یاسین دەرویش غفور
ئەندام

احمد مصطفى شافعی
ئەندام

محمد امین کریم رسول
ئەندام

عبدالرحمن عبدالکریم محمود
ئەندام

# سەرچاوەکان

## سەرچاوەی کوردی

-فازیل هیمەت رێبەری خێزانی چاپی دووەم

- لەیلا علی. گوناهەکانی ژن بوون و ستەمەکانی جەستە

## سەرچاوەی عەرەبی

- د. سامي الذيب، موآمرة الصمت، ختان الذكور والاناث ،عنداليهود والمسيحيين والمسلمين الجدل الديني - الطبي الاجتماعي القانوني

د. نوال السعداوی المرأة والصراع النفسي -

- الاستاذ.الدكتور احسان محمد الحسن، موسوعة علم الاجتماع .الدار العربية للموسوعات الطبعة الاولى ١٩٩٩

- د.نوال السعداوی. المراة والجنس

-د.محمود الحاج قاسم محمد ،د. عبدالعزيز الشهواني ١٤ه/٢٠٠١ م الختان تاريخه حكمة الشرعي طرق اجرائه

-عايدة احمد الرواجية ،البرودوالضعف الجنسي علاجه بالطب العربي والحديث

-د.عبدالهادى مصباح،ضعف الثقافة الجنسية ،سرشقاء الزوجين،الدارالمصرية اللبنانية

## سەرچاوەی ئینگلیزی

Zwangiles mutilations sexualize feminist, P 25 -

## سەرچاوەی وەرگێڕاو

- محسن ،د.منوچر، دەروازەکانی کۆمەڵناسی، کۆمەڵێك وەرگێڕ، ڕێبوارسیوەیلی......چاپی یەکەم .هەولێر،٢٠٠٢
- واین دایر، وەرگێڕانی لەفارسیەوە ناسر سەلاحی، هەست بەگەورەی خۆت بکە چاپی سێیەم.

## گۆڤارو ڕۆژنامە :-

- گۆڤاری هزر ساڵی ١٩٩٩ ژمارە٢
-ڕۆژنامەی ژیانەوەساڵی دەیەم ژمارە (٧٣٥ ) ٢ /٧/ ٢٠٠٦ خەتەنەکردن لەبەدواداچونێکدا

## ئینتەرنیت:-

-الختان والدين،قراءة دينية للختان،الاتفاقية الأمريكية لحقوق الانسان www.wfrt.net
-ختان الأناث و البتر التناسلي للاناث ( FGM ww.arabmedmag.com ) ٣١-١٢-٢٠٠٣
-ختان الأناث....بين العلم والدين
www.kurdistan.net-

## هاوكارەكان

-بەڕێز( كاك سۆران )توێژەری كۆمەڵایەتی لە دروستكردنی فۆرمو گریمانەكان ئامانجەكانی توێژینەوەكە،،دەستكاری كردنو چاككردنی لایەنی تیۆریو شیكردنەوەی زۆرینەی خشتەكانودەرئەنجامەكان....هتد

-بەڕێز(خاتوو مهابادحمە ڕەزا) توێژەری كۆمەڵایەتی لە چوارچێوەی گشتی توێژینەوەكەو لە سەرنجوپێشنیارەكاندا.

-خاتوو( ڕووناك فرج) لەبەشی تەندروستی چاودێری توێژینەوەكەو پەیوەندییەكان لەگەڵ زانایانی ئاینی ئیسلامودكۆترەپسپۆرەكان.

-ئاواز عبدالله لە تفریغ كردنی فۆرماكانو دروستكردنی خشتەكانو وینەیچارتی لایەنی مەیدانی توێژینەوەكەو نوسینی لایەنیتیۆریو چاپی توێژینەوەكە.

-لقوكۆمیتەكانی یەكێتی ژنانی كوردستان لە پڕكردنەوەی فۆرمەكاندا.